یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا
مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
20
ساڵی دووەم
کانوونی دووەمی
2010



# سپاردنی دەسەڵات...
# ئامرازێك بۆ گەشەپێدانی كارگێڕی

## هیممەتە بەرزەكان!

## ئازاری ویژدان!

## مووچەی خێزان
## پاروویەكی چەورو بۆمبێكی ئامادە!

## چۆن چێژ لە ژیان وەرگرین؟

## نرخی ڕاستەقینەی ژیان

## منداڵێك باسی خۆی دەكات

The first Magazin Especializined in Management
and Human Development in Kurdist

# بریار

گانەیەكی تایبەتە بە كارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ڵی دووەم – ژمارە 20 - كانوونی دووەمی 2010

**بە ڕێوەبەری نووسین**
بەرزان ئەبوبەكر

**سكرتێری نووسین**
ئەسكەندەر رەحیم

**ب: پەیوەندییەكان**
محەمەد هاشم محەمەد

**راوێژكاری یاسایی**
پارێزەر: ئازاد محیّدین

**دیزاین**
جەمال دەروێش

**بەشی ریكلام**
موسلیم محەممەد
07507602116

حساب بانكی گۆڤاری بریار
بانكی كوردستانی نێودەوڵەتی سلێمانی: ٣٣٧١

**تیراژ: ٣٠٠٠ دانە**
چاپخانەی سەردەم

**خاوەنی ئیمتیاز**
ئەندازیار مەسعود تاهیر رۆژبەیانی

**سەرنووسەر**
عادل محەمەد شێخانی
sarnosar@yahoo.com
07705033131








**بۆ دابەشكردنی بریار**

**هەولێر:** ٠٧٥٠٤٦٧٢٩٦٣ خانەی سیروان
**كەركوك:** ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ **هەڵەبجە:** ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ - ٠٧٥٠١١٢٩٤٢٧
**دەربەندیخان:** ٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ **كفری:** ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ **كەلار:** ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨
**چەمچەماڵ:** ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ **كۆیە:** ٠٧٧٠١٥٤٩٧١٤ **سۆران:** ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣
**چۆمان:** ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ **قەڵادزێ:** ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١ **رانیە:** ٠٧٧٠٢٢٩٣٦٢٨

**ناونیشانی گۆڤار**
سلێمانی- شەقامی سالم- تەلاری سلێمانی مۆڵ، نهۆمی/2
بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە
07702178682 3193946
E-mail: bryarmagazin@gmail.com
هەولێر- 07507658535 07504463230

گەڵاڕێزان گوڵی باخانی دابا
بەهارێ دیکە دێ ئەم داخە لابا
هەناسەی باخەوانی پیرە دەیگوت
هەزاران خۆزگە ژینی من، وەهابا

شەریف

یەکەم دڵۆپ

سەرنووسەر



# دواکەوتن!!

وەکو دەڵێن: مرۆڤ هەمیشە بە شوێن ئەو شتانەدا وێڵەو بەردەوام باسیان دەکات کە نییەتیو عەوداڵە بە شوێنیاندا، هەر ئەوەشە وایکردووە کە ئێمە زۆر باسی پێشکەوتن بکەینو کەمتر خۆمان لە باسو خوازی دواکەوتن بگەیەنینو قسەی لەسەر بکەین.

بەڵام هەرچەندە ئێمە لە نێوەندی دواکەوتندا دەژین بە هەموو رەهەندەکانییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تێگەیشتن لە ماهییەتو هۆکارو سیماو دیاردەکانی دواکەوتن کارێکی گرنگەو جێگای سەرنجو لێکۆڵینەوەی رۆشنبیرانە.

تا بتوانین لەو واقیعە دژوارە رزگارمان بێتو بتوانین هەنگاو بەرەو چارەسەری کێشەکانمان بنێینو بگەینە کاروانی پێشکەوتن.

روانین بۆ کێشەکانو بینینی واقیعی دواکەوتوویی ئێمە سەرەتا پێویستی بە زانیاریو مەعریفەتو رۆشنبیری تەواو هەیە، ناتەواوی لە زانیارییەکاندا دیدێکی لێڵمان لا دروست دەکاتو ناتوانین شتەکان لەسەر سروشتی خۆیان بناسین.

هەر بۆیە گرنگی نەدان بە زانستو زانیاریو خوێندنو توێژینەوەی جۆراو جۆرو بە دواداچوونی گرفتەکان لە دیارترین سیماکانی دواکەوتنە لای ئێمە.

چونکە نەزانی گەورەترین بنەمای دواکەوتنە بە تایبەت کاتێك دەگاتە لوتکەو تیایدا مرۆڤەکان بەرامبەر هەموو شتەکان بێ زانیارین بە تایبەت بە خودی خۆشیان، ئەوسا ژیان دەبێتە خولانەوە لە بازنەیەکی بە تاڵدا بێ بوونی هیچ ئاراستەو ئامانجێك.

مرۆڤە بێ ئامانجەکانیش هەمیشە بێ هیواو رەشبینی باڵی کێشاوە بەسەر چاویانداو ناتوانن تەماشای ئایندەیەکی رووناك بکەنو هەمیشە کاتێك خۆیان بەراورد دەکەن لەگەڵ وڵاتانی پێشکەوتوودا گەیشتن بە پێشکەوتنی ئەوان بە خەون دەزانن و زۆر جار بە راشکاوی دەڵێن: ئێمە هەرگیز نابین بە هیچ!!

کەسانی بێ سەوادو کەم ماریفەت بەندو کۆیلەی دابو نەریتە کۆنەکانی کۆمەڵگانو ناتوانن بیر لە چارەسەر بکەنەوە.

هەر لەبەرئەوەشە بۆ گەڕانەوەی مافی خوراویان هەوڵی چارەسەری بنەڕەتیو گەڕانەوەی ناکەن، بەڵکو ئەوانیش دەیانەوێت پارچەیەك لەو دوگە چەورە بپچڕن کە کەسانی تر دەستی بەسەردا گرتووە!!

بەو کارەش وەنەبێت ئێمە لە خاڵێکی چەق بەستوودا بمێنینەوە، چونکە پێشکەوتن وەکو دواکەوتن نییەو وەستانی نییە، لەبەرئەوە دواکەوتوو دواکەوتوو تر دەبێتو زێتر لە کاروان دوادەکەوێت.

یەکێکی تر لە دیاردەکانی دواکەوتن گەورەکردنی کێشەکانەو بە گەورەو ترسناك تەماشا کردنیانە، بە شێوەیەك کە هەموو چارەسەرێکی لا بچووك دەبێتەوە بەرامبەریان، لە کاتێکدا ئێمە دەتوانین زۆر بە ئاسانی قەبارەی سروشتی کێشەکان دیاری بکەین، بە هاوکێشەیەکی کورت کە دەتوانین بڵێین: قەبارەی کێشەکان یەکسانە بە جیاوازی لە نێوان ئەوەی کە هەیەو ئەوەی پێویستە بوونی هەبێت!

کێشەیەکی تر لە دیاردەکانی دواکەوتنی لە مەڕ خۆمان نەبوونی ئایدیایەکی روونو بەرنامەیەکی دروستە بۆ پێشکەوتنو وەلانانی دواکەوتن، ئەوەش تا ئێستا وایکردووە کە ئێمە نەگەیشتووینەتە خاڵی دەست پێکردن، بۆیە لەبری ئەوەی بە گۆڕینی پۆستێك هەنگاوێك بەرەو پێش بچین، دووبارە دەگەڕێینەوە سەر خاڵی سفر ئەگەر ئەو خاڵەشمان هەبێت؟!

دروشمی هەموو پۆستێکی تازە رەخنە گرتنە لەوانی پێشوو، هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو کارانەیە کە پێشتر کراوەو دروشمیان تەنها بریتییە لە (كلما دخلت أمة لعنت أختها).

مرۆڤە نەزانەکان هەمیشە کێشەیان لەگەڵ شتە ئەستەمو مەحاڵەکاندایە، لە کاتێکدا ئێمە گەورەترین کێشەمان شتە گونجاوو مومکینەکانە کە پێیان هەڵناسین، ئێمە زۆر شتمان پێ دەکرێت کە هێشتا نەمان کردووە، با جارێ ئەو شتانە ئەنجام بدەین کە لە تواناماندایە.

هاوکات ئەگەر بە چاوێکی کراوەو دیدێکی روونەوە تەماشای ئەو هەموو زەرەرو زیانانە بکەین کە دواکەوتن خوازان لە ئابوریو داهاتو ئایندەی نەوەکانی دەدەن، کارەساتێکی مرۆییو تاوانێکی زۆر گەورەیە.

بەڵام زۆر جار مرۆڤە خوێندەوارو نەخوێندەوارەکان لەبەر چەپڵە لێدان توانای بینینیشیان لە دەست دەدەن!!

هاوکات لە کۆمەڵگای دواکەوتوودا لە سایەی بە هەدەردانی کاتو سامانو سەرمایەی مرۆیی وڵاتو کەچ بینیو نەبوونی رۆشنبیریو زانیاری پێویستدا، لە بواری دواکەوتندا داهێنان دەکەینو لە بازنەیەکی بە تاڵدا تەنها گوێمان لە غەڵبە غەڵبێکی نەشاز دەبێت!!

کەواتە بۆ رزگار بوون لەم زەلکاوە پێویستمان بە نووخبەیەکی رۆشنبیری راستەقینە هەیە، کە بە قوڵایی کێشەکاندا رۆبچێو ئەم دیوو ئەو دیووی کێشەکان ببینێتو توانای بڕیاردانو بەرەنگار بوونەوەی بەربەستەکانی هەبێتو لەو پێناوەدا تێکۆشەرو ماندوو نەناسو دڵسۆز بێتو لە پێش هەموو ئەمانەشەوە راستگۆ بێت!

# كارگێڕی به گوفتار

دەوڵەمەندی شــتێكی رێژەییە، چونكە ئەوەی كەمی هەیەو قەناعەتی بە كەمتریش هەیە دەوڵەمەند ترە لەوەی كە زۆری هەیەو قەناعەتی بە لەوە زۆرتریش نییە! (چارلز كولتون)

هەندێك جار بە قسە درۆ دەكەینو هەندێ جاریش بەبێ دەنگی! (ئەدریان ریچ)

لغاوی ئەســپ بۆ گوێ درێژ نابێت! (پەندێكی چینی)

ژیــان پێشــبڕكێیەكە بــەرەو مــردن! (دانتــی)

ئەگەر راســتگۆیت، بۆچی ســوێند دەخۆیت! (شكســپیر)

گەورەترین ئازادی، ئازادی بیروهۆشە! (دوسانت)

هەژاری نیشــتمانی تاوانە! (ڤۆلتێر)

كاتێــك بەخشــینت دەوەســتێت، ژیانــت دەوەســتێت! (رۆز فیڵــت)

# کارگێڕی بە چیرۆك

ڕۆژێك لە ڕۆژان گەشتیارێك لە نزیك گوندێكدا هەڵوێستەیەكی كردو گومانی برد كە ڕێگاكەی هەڵە كردووە.

لەبەرئەوە لە جامی ئۆتۆمبێلەكەیەوە هاواری كرد لە یەكێك لە جووتیارەكان، كاتێك جوتیارەكە بە پیرییەوە هات، پێی گوت من پێویستم بە یارمەتی تۆ هەیە، چونكە ڕێگاكەم هەڵە كردووەو ڕێگەی ڕاستم لێ ونبووە.

كابرای جوتیار ساتێك سەرنجی دایە كابرای گەشتیارو پاشان پێی گوت: ئایا دەزانیت تۆ ئێستا لە كوێ دایت؟

گەشتیارەكە گوتی: بەڵێ پێش كەمێك لەمەوبەر ناوی گوندەكەتانم بینی لەسەر لافیتەیەك نووسرابوو.

ئەی دەزانیت ئێستا بەرەو كوێ هەنگاو دەنێیت؟

لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ، پاشان ئەو شوێنەی دیاری كرد كە بۆی دەچێت.

كابرای جوتیار ئەمجارە پێی گوت: براله تۆ ڕێگات هەڵە نەكردووە، بەڵكو تەنها پێویستت بە ئاراستەكردنو ڕێنمایی هەیە!

لەم چیرۆكەوە فێر دەبین كە:

١- زۆرجار ئێمە وەك كەسێكی ونبووی سەر لێشێواو هەنگاو دەنێین، وا دەزانین بوونەوەر ئێمەی فەرامۆش كردووە، لە كاتێكدا ئێمە خۆمان خۆمان لێ ونبووە.

٢- پێویستە مرۆڤ ئاراستەی خۆی دیاری بكاتو هەرگیز هەنگاوی كوێرانە نەنێیت.

٣- گرنگە كاتێك هەست بە سەر لێشێواوی دەكەین پرسیار بكەینو داوای یامەتی بكەین، چونكە بەردەوام بوون لەسەر هەڵە زێتر بە هەڵەماندا دەبات.

٤- بۆ كەسێك كە ئامانجی دیاری كردووە، زۆر گرنگە گرتنەبەری ڕێگای دروستو گونجاو، بەڵام بۆ كەسێك كە ئامانجی دیاری كراوی نییەو نازانێت بۆ كوێ دەڕوات.

گرنگ نییە هەر ڕێگایەك بگرێتە بەر.

٥- با كێشەكان بە سانایی وەربگرینو دنیامان لێ نەیەتەوە یەك، زۆر جار كێشەكان بە كەمێك بیركردنەوە چارەسەر دەكرێن.

٦- سوود وەرگرتن لە كەسانی دی زیرەكییە نەك عەیبە، ئەو كەسە زیرەكە كە بتوانێت سوود لە ڕاوبۆچوونی كەسانی تر وەربگرێت.

٧- كاتێك ئامانجمان ڕوونو ڕێگەمان ئاشكرایە، هەرگیز ترسمان لە ونبوونو سەر لێشێوان نییە.

٨- هەڵە كردن بۆ مرۆڤ زۆر ئاساییەو ئەزموونو شارەزاییمان پێی زیاد دەكات، نەك تووشی شكستمان بكات.

## تۆ

## تەنها پێویستت بە ئاڕاستەكردنە!




## چۆن تەحەكوم دەكەین بە سەركەوتنی دیزاینی هەڕەمی ڕێكخستن؟

بەڕێوەبەرانو ڕێكخەران دەتوانن كۆمەڵێك پێوەر بە كاربهێنن كە یارمەتیان دەدات لە سەر حوكم دان بە سەركەوتنی دیزاینی هەڕەمی ڕێكخستن، سەرەڕای ئەوەی كە ئەم دێڕانەی دوایی ئەم پێوەرانە پێشكەش دەكات! بەڵام بە كارهێنانەكەی هەر ئەنجامێكی خەملێنراومان پێدەدات! چونكە بەڕێوەبەرانو ڕێكخەرانن كە تەحەكوم بە دەرەنجامی كۆتایی دەكەن، ئەم حوكمەشیان خەملێنراو دەبێت، چونكە لەوانەیە بیپێكن یا نا! لە هەمان كاتدا ئەم پێوەرانە لە ئاستی بەڕێوەبەرو ڕێكخەر بەرزدەكاتەوە تا ئاستی گەیشتن بە ڕاستییەكان (كە ببێت)، ئەمانەی خوارەوەش گرنگترینی ئەم پێوەرانەن كە یارمەتیدەرن بۆ تەحەكوم كردن لە سەر سەركەوتنی دیزاینی هەڕەمی ڕێكخستن كە لە شێوەی ژمارە (١)دا خۆی دەردەخاتو بریتین لە:

١- توانای هەرەم پەیكەر لە سەر گەیشتن بە ئامانجی ڕێكخراو.

٢- لە یەكچوونی ناوخۆیی لە نێوان یەكەكانی ڕێكخستن.

٣- ئاسانی كاركردن.

٤- چاودێریو ڕێككاری.

شێوە ژمارە (١): پێوەرەكانی حوكمدان لە سەر سەركەوتنی دیزاینی هەرەمی ڕێكخستن:

یەكەم: توانای هەرەم لە سەر گەیشتن بە ئامانجی ڕێكخراو:

هەر ڕێكخراوێك ئامانجێكی كۆتایی هەیە كە بریتییە لە قازانج یا مانەوە یا بەردەوام بوون لە بازاڕو هی تریش لە ئامانجی كۆتایی، ئەوەش كە ئاستەم وەردەگێڕدرێتە سەر هەرەمی ڕێكخستن، لێرەدا دەبینین كە ئامانجی پراكتیكی هەیە كە لە یاسای دامەزراندنی كۆمپانیا یا ڕێكخراوەكەدا هاتووە (كە پەیامەكەی Mission دیاری دەكات) بە شێوەیەكی پیشەیی، بە واتای دەستنیشان كردنی كارە سەرەكیو چالاكییە گرنگەكان دەكات لە ژیانی ڕێكخراودا، بۆ نموونە ڕێكخراوێك ئەركەكەی فرۆشتنی جلوبەرگ بێت پێشبینی دەكرێت كە گرنگترین چالاكییەكانی كڕینو كۆگاو بە بازاڕخستن بێت، هەر بۆیە دەبێت كە ئەم چالاكیانە لە شێوەی بەشی سەرەكی لە هەرەمی ڕێكخستن دەربكەون، ڕێكخراوی تر كاردەكات لە بواری بەرهەمهێنانی قوماش هەر دەبێت كە چالاكیە سەرەكییەكانی بریتی بن لە بەرهەمداریو بازارسازی بە هاوكاری چالاكییە داراییو كارگێرییەكان، ئەم چالاكیانەش بە هەمان ناولێنانی كارگێڕی یا بەشە سەرەكییەكان دەبن لە هەرەمی ڕێكخستن.

ئەگەر هاتوو ئامانجەكەی (یا ستراتیژییەكەی) ڕێكخراو گۆڕدرا بە شێوەیەك كە پێویست بكات چالاكی نوێ بگرێتە خۆی، هەر دەبێت كە ئاماژە بەم چالاكیانە بكرێت لە شێوەی یەكە نوێیەكانی ڕێكخستن، بۆ نموونە ئەگەر هاتوو ڕێكخراو پێویستی بە چالاكییەكی نوێبوو، وەكو توێژینەوەكانی بازارسازی بۆ كۆنترۆڵ كردنی نادڵنیایی لە بازاڕو ناسینی ئاراستەكانی بازاڕو ڕكابەران، پێویست دەكات كە بەشێك یا كارگێرییەك تەرخان بكرێت لە ژێر ناوی (بەشی توێژینەوەی بازارسازی Marketing Research)، هەر بەم شێوەیە ڕێكخراوەكان لە گەشەسەندن و بەرەو پێشەوە چوونیان چالاكییەكانیان زیاد دەبێت كە لە گەڵیشیدا پێویستی بە یەكەی ڕێكخستنی نوێ دەبێت.

دووەم/ لە یەكچوونی ناوخۆیی نێوان یەكەكانی ڕێكخستن:

سەركەوتنی دیزاینی هەر هەرەمێكی ڕێكخستن هەر دەبێت كە ڕەنگدانەوەی لە یەكچوونی ناوخۆیی بێت لە نێوان یەكەكانی ڕێكخستن، لە یەكچوونیش ئاماژەیە بۆ بوونی مەنتیق و هۆكاری ڕوون بۆ كۆكردنەوەی یەكە بچووكەكان لەگەڵ یەكتر تاوەكو ببنە یەكەیەكی گەورەتر (كە لقە بچووكەكان بەش پێك دەهێنن، بە شەكانیش دەبن بە كارگێڕی، كارگێرییەكانیش كەرتە گەورەكان پێك دەهێنن)، لێرەدا مەنتیق و لە یەكچوونیش ئاماژە دەكات بەوەی كە ئەم لق و بەش و كارگێڕی و كەرتانە هاوشێوەن لە چالاكییەكانیان یان لە نێوان خۆیاندا تەواوكارن، یان بە دوای یەكن لە كاتی ئەدائیان.

بۆ نموونه دەبینین كە ژمێریاری كڕیارەكان و ژمێریاری گەنجینە و ژمێریاری كرێ دەتوانرێت لە یەك كارگێڕی كۆبكرێتەوە بە ناوی (كارگێڕی ژمێریاری)و ئەم بەیەك بەستنەوەیەش لە پێناو لە یەك چوونیانە، لە هەمان كاتدا دەبینین كە نزیك بوونەوەی ئەم كارگێڕییەی كە تایبەتە بە ژمێریاری لەگەڵ كارگێڕییەكانی تری وەك تێچوون و شیكردنەوەی دارایی و بوودجەكان لە كەرتێكی گەورەتر كە پێی دەوترێت: كاروباری دارایی، ئەمەش لەسەر بنەمای تەواوكاری دەبێت (بە جۆرێك كە ژمێریاری لەگەڵ هەر یەك لە تێچوون و شیكردنەوەی دارایی و بوودجەكان لە شێوەی كەرتی دارایی یەكتری تەواو دەكەن).

سێیەم/ ئاسانی كاركردن:

ئاماژە دەكات بە بەدوای یەكی كارەكان بە سانایی و لەبەر چاوگرتنی جووڵەی كاركردن كە وا دەكات كاركردن خۆش و خێرا بێت، دڵخۆشی كرێكارەكان لە ناوخۆیی یەكەكان لەگەڵ خێرایی كاركردن دەتوانێت پێشنیاری دووبارە ڕێكخستنەوەی یەكەكان بكات، ئەگەر هاتوو دووبارە ڕێكخستنەوەی یەكەكان دەبێتە دڵخۆشی كرێكارەكان و خێرایی و كەمكردنەوەی پەستانەكان، دەبێتە هۆی ڕەزامەندی كرێكارەكان، لەسەر ڕێكخراویشە كە بڕیاری لە سەر بدات، هەر بۆ نموونە دەتوانین دووبارە ڕێكخستنەوەی كارگێڕی گەنجینە بكەین كە سێ بەشی بەدوادا دێت ئەوانیش بریتین لە بەشی كەرەستەی سەرەتایی، بەشی پارچە یەدەگەكان، بەشی كاڵای ئامادەكراو بۆ فرۆشتن، لێرەدا كارگێڕی گەنجینە دووبارە ڕێك دەخرێتەوە لە ڕێگای لە یەك كردنەوەی، كە بەشی كەرەستەی سەرەتایی بەدوای كارگێڕی بەرهەم (Production Management) دا دەڕوات و بەشی پارچە یەدەگەكان بە دوای بەشی چاكسازی، بەشی كاڵای ئامادەكراو بۆ فرۆشتن دەچێتە سەر بەشی كارگێڕی بە بازاڕخستن، لە وانەیە ئەم كارەش ببێتە هۆی كەمكردنەوەی گیروگرفتەكان و خێرایی و ڕەزامەندی كرێكاران و كڕیاران، لێرەدا لە سەر بەرپرسانی پرۆسەی ڕێكخستن پێویستە كە كۆمەڵێك وێناكردن (تصورات) دابنێن بۆ ڕێكخستنەكەیان، تەحەكومیشی پێبكەین بە جیاوازی ئەم وێناكردنانە لە ڕووی ئاسانی كاركردن و سانایی و جووە و ڕەزامەندی كڕیارو كرێكارو خێرایی لە ڕێ و شوێنی كاركردن.

چوارەم/ چاودێری و ڕێك كاری:

ئاماژە دەكات بەوەی كە ڕێكخستنی دروست دەرفەتی باش دەرەخسێنێت بۆ بوونی ڕێك كاری ناوخۆیی لە نێوان یەكەكانی ڕێكخستنی سەر بە یەكێك لە كارگێڕییەكان، بە دواداچوونی ڕێك كاری ناوخۆیی بە مانای هەڵنەستانی یەكەیەكی ڕێكخستن بە كۆمەڵێك یا ژمارەیەكی زۆر لە چالاكی جێبەجێكردن و چاودێری لە یەك كاتدا، چونكە نابێت كە كەسێك جێبەجێكار بێت و لە هەمان كاتیشدا چاودێری خۆی بكات! ئەگەر وا بێت دەتوانێت كە فەرامۆشی و خەوش و گرفت و كەموكورییەكان بشارێتەوە وەكو دەڵێن (حامیها حرامیها) پارێزەرەكەی دزەكەیە، یەكێك لە ڕێساكانی ڕێكخستن بریتییە لە پێویستی لە یەك كردنەوە یا جیاكردنەوەی جێبەجێكردن لە چاودێری بۆ بنەمای پرۆسەكانی ڕێك كاری ناوخۆیی لە نێوان یەكەكانی ڕێكخستن، بۆ نموونە كارگێڕی بەرهەم نابێت لە ناو بەشەكانیدا بەشی تایبەت بە چاودێری جۆری (Quality Control) بەدی بكرێت، چونكە گەر وانەبێت كارگێڕی بەرهەم دەتوانێت گیروگرفتەكانی بشاردرێتەوە بە جۆرێك كە بەشی چاودێری جۆری هەڵدەستێت بە داپۆشینی گرفت و خەوشەكانی هەموو بەشەكانی تری بەرهەم، هەروەك ئاستەم دەبێت كە بەشی كڕین لەگەڵ بەشی وەرگرتن و بەشی گەنجینە لەیەك كارگێڕییدا بە یەكببەسترێتەوە بە جۆرێك كە بەشی وەرگرتن دەتوانێت چاوپۆشی بكات لە بەشی كڕین و لە هەمان كاتیشدا لەگەڵ بەشی گەنجینە.

لە كۆتاییشدا دەتوانین كە لیستی پێداچوونەوە بۆ بەڕێوەبەران بخەینە بەردەستی خوێنەری بەڕێز لە سەر چۆنیەتی تەحەكوم كردن بە سەركەوتنی یەكەكانی هەرەمی ڕێكخستن وەك ئەم خشتەیەی خوارەوە:

| | پێوەرەكانی سەركەوتنی هەرەم لە شێوەی یەكەكانی ڕێكخستن | وەڵام | | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| | | بەڵێ | نەخێر | |
| ١ | ئایا یەكە نوێیەكان توانای داپۆشینی هەموو ئەو كارانەیان هەیە كە ڕێكخراو پێویستیەتی؟ | | | |
| ٢ | ئایا قەبارەی كار لە هەر یەكەیەك بە ڕوونی دیاریكراوە؟ | | | |
| ٣ | ئایا یەكەكان توانادارن لە سەر بە جێگەیاندنی قەبارەی كارەكان تیایدا؟ | | | |
| ٤ | ئایا ژمارەی كرێكاران لە هەر یەكەیەك گونجاوە؟ | | | |
| ٥ | ئایا كارو ئەركی ناپێویست هەیە لە یەكەكان كە بتوانرێت هەڵبوەشێنرێتەوە یان بخرێتە سەر لایەنێكی دەرەكی؟ | | | |
| ٦ | ئایا وەسفكردنێكی ورد هەیە كە كارەكانی هەر یەكەیەك دیاری بكات؟ | | | |
| ٧ | ئایا ئەم یەكانە دەتوانن گوزارشت لە ئامانجی ڕێكخراو بكەن و یارمەتی دەستەبەركردنی بدەن؟ | | | |
| ٨ | ئایا لە یەكچوون و گونجانی ناوخۆیی لە نێوان یەكەكان هەیە؟ | | | |
| ٩ | ئایا یەكە نوێیەكان دەتوانن كە كارئاسانی بكەن و وابكەن كە خێراترو بە تواناتر بن؟ | | | |
| ١٠ | ئایا هەرەمی نوێ زامنی ڕێك كاری ناوخۆیی و چاودێری دەكات؟ | | | |
| ١١ | ئایا دەتوانرێت كە كارمەندی پسپۆڕ دابین بكرێت كە خاوەن توانست و شارەزاییە لە كاركردن لەم یەكەیە؟ | | | |
| ١٢ | ئایا پەیوەندی نێوان یەكەكانی ڕێكخستن بە ڕوونی دیارە؟ | | | |
| ١٣ | ئایا خشتەی پێدانی دەسەڵات و بەرپرسیاریەتی ڕوونە بۆ هەر یەكەیەكی ڕێكخستن؟ | | | |
| ١٤ | ئایا هیچ دووبارە بوونەوەیەك لە كاری نێوان یەكەكان هەیە؟ | | | |
| ١٥ | ئایا ڕەزامەندی بەڕێوەبەران هەیە لە سەر هەرەمی نوێی یەكەكانی ڕێكخستن؟ | | | |

# خاڵە بەهێزەکانت بخەرە گەڕ

بەشی چوارەم



و/ ئەسکەندەر ڕەحیم

هەنگاوی چوارەم

خاڵە لاوازەکانت کۆتو کەلەپچە بکە.

ئەو شتەی کزو لاوازت دەکات، چۆن وازی لێدەهێنیت؟

وای دابنێ خاڵە لاوازەکانت ئەو دوژمنە خوێنخۆرو سەرسەختەی تۆیە، بۆت لە بۆسەدایەو ئاواتەخوازە تا کاروبارو ژیانو گوزەرانت لێ تفتو تاڵ بکات. هەر لەبەرئەوە زۆر گرنگەو جێی خۆیەتی خاڵە لاوازەکانت بە وردی بناسیت، بۆ کەلەپچەکردنیان تێبکۆشیتو سنورێك بۆ شوێنهاتو کاریگەرییە خراپەکانیان بەسەر ژیانتەوە دابنێیت. ڕەنگە نەتوانی بە یەکجاری لەکۆڵ خۆتیان بکەیتەوە، سەرباری ئەوەش کەمکردنەوەیان لە خشتەی کارەکانتدا، بە ئەرکێکی رۆژانە دابنێ. خاڵە لاوازەکانت وەك بۆمبە کاتییەکان وان، لەپڕاو بێ ئاگاداری پێتدا دەتەقنەوە. جابۆیە هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانیانەوەو پێش تەقینەوەیان هەوڵی پوچەڵکردنەوەیان بدە. ئەوەش جارێك بە زیرەکانە رەفتارکردنو دوورکەوتنەوە لەو کارو چالاکییانەی ئەو خاڵە لاوازانە دەردەخەن، جارێکی دیکەش بە هەڵکردن لەگەڵیاندا بۆ ماوەیەکی کورت دەبێت.

ئەشێ لەمەوبەر هەستت بەو شوێنەوارو کاریگەرییە ناخۆشانەی خاڵە لاوازەکانت کردبێت، کاتێك هەفتەیەکی ناکامو نامرادت لەکارەکەتدا بەسەر بردووە.

بە گشتی باری دەروونی شێواندوویتو جێ دەستێکی نەخوازراوی بەسەر پشووی هەفتەو ژیانی تایبەتیتدا جێ هێشتووە. بۆیە بیر لەوەی چوو مەکەرەوە، دڵنیاشبە گەر خاڵە لاوازەکانت بە باشی ناسیو لەپەراوێز خستنیان سەرکەوتوو بوویت، هەرگیز دووبارە نابنەوە.

## چوار هونەر

بۆ کەمکردنەوەی خاڵە لاوازەکانت

ئەگەر لە خاڵە لاوازەکانت قوتار بوویت، توانیوتە ئاگات لێیان بێتو نەبوویتە نێچیرێکی چەور بۆیان. یەکسەر دەست بدەرە قەڵەمو چی لەبەرنامەی تۆکمەکردنی هەفتانەدا پێی هەڵدەسیت، بینووسە. بێ ترسان لە کاریگەری خراپی خاڵە لاوازەکانت، ئەم هەفتەیەت دەست پێ بکە. خۆ ئەگەر نەتزانی چ شتێك پێویستە ئەنجامی بدەیت، ئەمە چوار هونەرو رێوشوێن بۆ تۆ، کە بۆ کەمکردنەوەی ئەو کاتەی لە چالاکییە ناکامو ناسەرکەوتووەکاندا بەکاری دەهێنیت، هەروەها ئەو چالاکییانەی خاڵە لاوازەکانت دەوروژێننو زەقیان دەکەنەوە، یارمەتیت دەدەن.

سەرەتا سێ چالاکی هەرە خراپ کە ئەنجامگەیاندنیان بێ تاقەتو بێزارت دەکەن، دەستنیشان بکە، هەر وەك ئەو سێ چالاکییە هەرەباشەی پێیان خۆشحاڵ بوویت.

> با سبەینێت لە ئەمڕۆت بەهێزتربێت، چونکە هەر کە خاڵە بەهێزو تواناو بەهرە شاراوەکانت ناسی، بۆ هەمیشە بەهێزترو سەرکەوتووتر دەبیت

ئەو چوار هونەرەش ئەمانەن:

١- ئەنجام گەیاندنی ئەو چالاکیانە رابوەستێنە، تا بزانیت ئاخۆ کەسێك سەرنجی ئەوە دەدات یان نا.

٢- لەگەڵ کەسە دەرکەوتووەکان لە ئەنجام گەیاندنی ئەو کارانەی حەزت لێیان نییە، هاوکاری بکە.

٣- کارو فەرمانێك هەڵبژێرە کە ئەو چالاکیانەی بە دڵتن لە خۆ دەگرێ، نەك ئەوانەی لێیان نابەدڵیت.

٤- لە روانگەیەکی تازەوە بڕوانە خاڵە بەهێزەکانت، بێ ئەوەی هەست بە دابەزینی سەنگینیو رەنگینیت بکەیت. چونکە هەموو کەسێك هەم خاڵی لاوازی هەیە هەم بەهرەو توانا. کەسێکیش تێرو تەسەلو بێ کەمو کورتی بێت، لەم ژینەدا نایبینیتەوە.

د. محمد احمد عبدالجواد
و: حسین محمود هەڵەبجەیی

زنجیرەی دووەم

# چۆن کۆبوونەوە کورتو بەرهەمدارەکان، دەبەستیت؟

دڵنیابە لەوەی کە پێویستیت هەیە بە کۆبوونەوە.

بانگەواز بۆ ئامادەبوونی کۆبوونەوە/ سەرپەرشتیارییەکەی ئێمە زۆر سەیرە هەرشتێ بە بیریدا بێت کۆبوونەوەیەکمان پێ دەکات:

یەکەم جار دڵنیابە کە پێویستت بە بەستنی کۆبوونەوە هەیە:

* زۆر بە باشی ئەم پەیوەندییەت لە یاد بێت کە دەڵێ: (ئەگەر تۆ خاوەنی خەون نەبیت، چۆن دەتوانیت خەونەکەت بێنیتە دی؟) بەو شێوەیە ئەگەر کۆبوونەوەکەت مەبەستێکی تێدا نەبێت ئیتر ئەو کۆبوونەوەیە چۆن ئامانجەکەی بێنێتە دی؟

* ئەگەر کۆبوونەوەکەت گرنگ نەبێت، ئەوە باشتر وایە ئەو کۆبوونەوەیە هەڵبوەشێنیتەوە!!

* لە یادت بێت کە کۆبوونەوەکان هۆکارن بۆ ئامانجێك، خۆیان بۆ خۆیان ئامانج نین.

* ئەگەر ناچار بوویت کە کۆبونەوەکانت دەوری بن (ناوبەناو)، پێویستە رووبەری کات لە هەموو کۆبوونەوەکاندا وەك یەك نەبن.

* لە یادت بێت ئامانج رێگا دیاری دەکات، هەروەها هاوڕێیانی رێگاش دیاری دەکات.

* ئامانجی کۆبوونەوەکانت بنووسە، ئەوە یارمەتی دەرە بۆ چاکیو تەواو کردنی، بە وشەی روونو ئاشکرا لەگەڵ بەشداربوواندا بدوێ.

* ئەگەر ئامانجو مەبەست لە کۆبوونەوەکە ئاشکرا بوو ئەو کاتە بەشدارییەکی کاریگەر لەگەڵ ئامادەبوواندا پێك دێنێتو دەیبینیت.

* لە بەردەم رۆشنایی ئاشکرایی ئامانجدا هیچ ئەندامێك پرسیارێك ئاڕاستە ناکات، کە پەیوەندی بە بابەتی وتوێژەکەوە نەبێت.

* لەبەردەم رۆشنایی ئاشکرایی ئامانجدا، هیچ وتوێژێکی لاوەکی لە نێوان ئەندامانداا دروست نابێت.

* بوارێکی فراوان بە ئامادەبوان بدە بۆ بەشداربوون لە دانانی ئامانجی کۆبوونەوەکەدا تاوەکو هەست بە گرنگییەکەی بکەن.

* لە یادت بێت حەزی ئامادەبووان بۆ ئامادەبوونو ئاوێتە بوون لەگەڵیدا بەستراوە بە سەرکەوتنی کۆبوونەوەکە.

ڕاهێنانی پراکتیکی (عملی):

چۆن خەرجی مادیو کاتی کۆبوونەوەکەت مەزەندە دەکەیت:

یەکەم/ خەرجی مادی کۆبوونەوەکە:

١- مووچەی ئامادەبووان کۆبکەرەوە لە ساڵێکدا.

٢- خەرجی بەڕێوەبردنەکانی بۆ زیاد بکە لە ساڵێکدا، کە یەکسانە بە مووچەکە.

٣- هەمووی دابەش بکە بە سەر (١٠،٠٠٠) دا، تاوەکو خەرجی کۆبوونەوەکەت بۆ دەربکەوێت لە (١٠) خولەکدا.

٤- ئەو خەرجییە لێك بدە لەگەڵ (٦) دا، تاوەکو خەرجی کۆبوونەوەکەت بۆ دەربکەوێت لە یەك کاتژمێردا.

٥- ئەو خەرجییە لێك بدە لە ماوەی کۆبوونەوەکە، تاوەکو خەرجی مادی کۆبوونەوەکەت لەسەردەزگاکە بۆ دەربکەوێت.

نمونەیەکی شیکارکراو/

١- مووچەی ئامادەبووان ٥٠٠×١٠ (ژمارەکەیان) × (١٢ مانگ) = ٦٠٠٠٠

٢- خەرجییە ئیدارییەکان= (کە یەکسانە بە مووچە)= ٦٠٠٠٠ کۆی گشتی= ١٢٠٠٠٠.

٣- ١٢٠٠٠٠ ÷ ١٠٠٠٠ = ١٢ دینار (خەرجی کۆبوونەوەکە لە ١٠ خولەکدا).

٤- ١٢× ٦= ٧٢ دینار (خەرجی کۆبوونەوەکە لە هەر کاتژمێرێکدا).

٥- ٧٢ × ٥ = ٣٦٠ دینار خەرجی ماددی کۆبوونەوەکە لە سەر دەزگاکە.

خەرجی کاتی کۆبوونەوەکە:

١- ژمارەی ئەو کاتژمێرانە بژمێرە کە لە کۆبوونەوەکەدا تەواو بووە.

٢- ژمارەی ئەو کاتژمێرانەی کە لە کۆبونەوەکە تەواوبووە × ژمارەی ئامادەبووان...... ئەو کاتەش خەرجی کاتی کۆبوونەوەکەت بۆ دەردەکەوێ لەسەر دەزگاکە.

نمونەیەکی شیکارکراو:

١- ژمارەی ئەو کاتژمێرانەی لە کۆبوونەوەکەدا بە سەربراوە = ٤ کاتژمێر.

٢- ٤ کاتژمێر × ٧ (ژمارەی ئامادەبووان) = ٢٨ کاتژمێر (خەرجی کاتی) کۆبوونەوەکە لە سەر دەزگاکە.

ئەگەر هەمووان هەست بە خەرجی مادی کاتی کۆبوونەوەکان بکەن، ئەوە ئەو کاتە کۆبوونەوە ناگرنگەکانمان کەم دەبێتەوە.

ساتێك لێوردبوونەوە پاش هەموو کۆبوونەوەیەك:

پاش هەموو کۆبوونەوەیەك ئەوەی ئەنجامدراوە لە داواکاریو بڕیارەکان بهێنەرەوە پێش چاوی خۆت... لە خۆت بپرسە... ئایا ئەو داواکاریو بڕیارانە یەکسانە بەو کاتو هەوڵدانەی کە خایاندویەتی؟

لەوانەیە ئەو ساتی لێووردبوونەوەیە پاڵنەرێك بێت بۆت بۆ گۆڕانکاری نەریتەکانت لە بەڕێوەبردنی کۆبوونەوەکاندا..

# بۆچی بەڕێوەبەرانی سەرچاوەی مرۆیی پێویستە ڕابەرایەتیکردنێکی هاوبەش بەکار بێنن؟

و/ ئاراز عەبدوڵا زرار
بەڕێوەبردنی گشتی/ زانکۆی ئەمریکی بەیروت - لوبنان

## سوودەکانو زیانەکانی ڕابەریکردنی هاوبەش

ڕابەریکردنی هاوبەش پێناسە کراوە وەك "هەوڵدانێك لە لایەن بەڕێوەبەر بۆ ئاسان کردنو بەشداری پێکردنی کەسانی تر لە بڕیاردان، کە بە شێوەیەکی ئاسایی ئەو بڕیارانە بە تەنها لە لایەن خۆیەوە دەدرێ" یوکل. هەروەها بەم شێوەیەش پێناسەکراوە کە"ڕابەر ئەندامەکانی ڕێکخراو بەشداری پێدەکات. ئاستی بەشداریکردنی بریتی دەبێت لە گۆڕینەوەی زانیاری، بیرۆکەو پێزانین لە لایەن ئەندامەکانەوە لەگەڵ ڕابەر." (وێبگەی دیسیژن مەیکینگ) هەرچەندە سوودەکانو زیانەکانی ڕابەریکردنی هاوبەش دەوەستێتە سەر ئەوەی کە کێ بەشداری پێکراوە لە پرۆسەکە. لە لایەن یوکل (١٩٩٤) ئاماژەی پێکراوە کە "سوودە شاراوەکان بەشێکی دەوەستێتە سەر ئەوەی کە کێ بەشداری پێکراوە لە بڕیاردانەکە..." .

سوودەکانی ڕابەریکردنی هاوبەش:

ڕابەریکردنی هاوبەش چەندان سوودی هەیە، دەبێتە هۆی دروستکردنو پشکنینی چەندان تێڕوانینی جیاواز. سەرەڕای ئەمەش، هەستی بەشداری کردن لە بڕیاردان حەزێك بۆ ژێردەستە دروست دەکات تا زۆر کاریگەرانە بڕیاری دراو بە هاوبەشی جێبەجێ بکاتو بیگەیەنێتە ئامانجی دیاریکراو. ئاماژەی پێدراوە کە هەستی بەشداری کردن دەبێتە زانیاری تێخستن لە لایەن هەریەك لە ژێردەستەکان لە پرۆسەکە. ئەو هەستی بەشداری کردنە زۆر یارمەتی دەرە بۆ کەمکردنەوەی ئەنجامی نالەبار لەسەر ژێردەستی کارلێکراو کاتێ چەند گۆڕانکارییەکی نەویستراوی دیاریکراو خەریکە ڕوو دەدەن. هەروەها دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی هۆی تۆقینو سەرسوڕمان لە لایەن ژێردەستە کاتێ بەشداری دەکات، لەگەڵ ڕابەر بۆ کارکردن لەسەر هەڵوێستێکی سەخت (وێبگەی دیسیژن مەیکینگ). یوکل (١٩٩٤) ڕوونکردنەوەی زیاتر بۆ ئەو سوودە دەدات. شیدەکاتەوە کە بەشداریکردنی فەرمانبەر یارمەتیدەرە لە پەسەندکردنو جێبەجێ کردنی بڕیارەکە لە لایەن فەرمانبەرەکە، کە بە زۆری «ئەو کردارە بەشێکە لە پرۆسەی سیاسی» بۆ بەخشینی شێوەیەکی یاسایی بە بڕیاری دراو. ئاماژە بە سوودی تری ڕابەرایەتی کردنی هاوبەش دەکاتو دەڵێ: کاتێك فەرمانبەر شارەزایی خۆی لەگەڵ بەڕێوەبەر بەشداری پێدەکات بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەك بۆ کێشەیەك یان بۆ بڕیاردانێك، ئەوا لە جۆریەتی بڕیارەکە زیاد دەکات، چونکە بڕیارەکە بنەما دەگرێت لەسەر زانیاری. بەشداربووان خۆیان زیاتر پەیوەست دەبینن کاتێ هەست دەکەن کە کاریگەریان هەبووە لە پرۆسەی بڕیاردانەکە. ژێردەستەکان ڕازی دەبن بە بڕیاری دراو، چونکە وا تێگەیشتوونە کە ئەوان خاوەنی بڕیارەکەن، یوکل (١٩٩٤) باوەڕی وایە کەبەشداری پێکردنی فەرمانبەر لە بڕیاردان یارمەتیدەرە لەسەر دەوڵەمەند کردنی توانای کارکردنی فەرمانبەر، کاتێ ئێمە فەرمانبەرەکانمان بەشداری پێدەکەین لە پرۆسەی بڕیاردان، ئەوا کارامەیی شیکردنەوەی بڕیاردانیان باشتر دەبێ کە ئەمەش یارمەتیدەر دەبێ لە ڕیشەکێش کردنی کێشەکانو دروستکردنی چارەسەری باشتر. ڕابەریکردنی هاوبەش تەنها یارمەتیدەر نییە لەسەر دەوڵەمەند کردنی کار، بەڵکو یارمەتیدەرە لەسەر دروستکردنی تیمو سەقامگیرکردنی ململانێی نێوان کۆمەڵو تاك. ڕابەریکردنی هاوبەش هاریکاریو تەنسیق دروست دەکات لە نێوان بەشداربووان کاتێ کە هەموویان کاردەکەن بەرەو یەك ئامانجی بڕیار لەسەردراو. لە هەمان کاتدا ئەمەش یارمەتیدەر دەبێ بۆ بەڕێوەبەر. یارمەتی بەڕێوەبەر دەدات بۆ درك پێکردنو تێگەیشتن، «پێداویستیەکانو حەزەکانی ژێردەستە، بەهێزکردنی تۆڕی دەرەکی، باشترکردنی ڕێکخستنو چارەسەرکردنی کێشەی دوولایەنە تایبەت بە کار.» پاوێلو هاوەڵەکەی (١٩٧١) باس لە سوودی دەروونی دەکەن بۆ فەرمانبەر. ئاماژە دەکەن کە بۆ دەرونزانان، بەشداریکردنی لە بڕیاردان یارمەتی فەرمانبەر دەدات لەسەر فێربوون لە ژینگەیەکی دیموکراتیانە. (ئەرگریس) سوودەکانی ڕابەریکردنی هاوبەش ئاماژە پێ دەدات، لەلای ئەو، ڕابەریکردنی هاوبەش هەستی بە کۆمەڵ بوون زیاد دەکات بۆ بەشدار بوو، لە ئەنجامدا ئەمەش دەبێتە زیادبوونی پێوەلکانو پەیوەندی کۆمەڵەکە، لەبەرئەوەی کە «پلەی هەستی ئێمە یان ئەو پەیوەندییەی بەشداربووان هەیانە لەگەڵ ڕێکخراو زیاد دەکات». یارمەتی ژێردەستە



دەدات بۆ بینینی وێنەیەکی گەورەتری ڕێکخراوەکەو تێڕوانینو ستراتیژییەکانی. جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە ڕابەریکردنی هاوبەش یارمەتی دروستکردنی تیم دەدات. لەبەرئەوەی ڕێگە خۆش دەکات بۆ بەشداربووان بۆ توێژینەوەو تێگەیشتنی زیاتر دەربارەی یەکتر کە ئەمەش دەبێتە هۆی زیاد بوونی سنگ فراوانیو تێگەیشتن لە نێوانیان. بڕوای وایە کە ڕابەریکردنی هاوبەش دەبێ بە شێوەیەکی شیاو و گونجاو پراکتیزە بکرێ. ئاماژە بەوە دەکات کە سوودەکانی ڕابەریکردنی هاوبەش دەوەستێتە سەر پراکتیزەکردنی شیاو. ئەگەر بەشێوەیەکی شیاو پراکتیزە بکرێ، ئەوا دەبێتە هۆی زیادبوونی ئازادی رادەربڕینی بەشداربووان. ژینگەیەکی دیموکراتی ئاوا، ڕێگر دەبێ لە کێشەی دەروونی وەکو ترسو هەڕەشە لێکردن. کاتێ ژینگەی کار دیموکراتیە، بەشداربووان خاوەن دەروونی ئاسوودەن. تامی ئازادی ڕادەربڕین دەچێژنو بیری دروستکەرو داهێنان زیاد دەبێت لە لایان. لە ئینساکلۆپیدیای ڕابەریکردن بەرگی یەك، ڕابەری کردنی هاوبەش ناوێکی تری لێنراوە: ڕابەریکردنی دیموکراتیانە. ڕابەریکردنی دیموکراتی یان هاوبەشی ئاستێکی بەرز لە کاریگەری تیم دروست دەکات» (گۆیسال، سۆینسن& بوورنس ٢٠٠٤). لە هەمان بەرگ ئاماژەکراوە کە "کە یەك لە لێکۆڵینەوەکان کە تێیدا شێوازی ڕاوێژکردن لە ڕابەریکردنی هاوبەش لەگەڵ ڕابەریکردنی ئاراستەکردن بەراورد کراوە، ئەوەیان بۆ دەرکەوتووە کە بۆ کارێك کە داهێنانی تێدا پێویست بێ، تێیدا پێویست بکات کە بەشداربووان زانیاری بە شێوەیەکی نادیار تێبخەن، ئەوا ژێر دەستان پاڵپشتی خۆیان بۆ ڕابەریکردنی هاوبەش دەربڕی." لە کۆتاییدا، لە بەرگی سێیەم لە هەمان ئینسایکلۆپیدیا، ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕابەریکردنی هاوبەش ڕێبازێکە لە وڵاتانی خاوەن ئاستی دووری دەسەڵاتی نزیك بەکاردێت «ڕابەریکردنی هاوبەش بە شێوەیەکی نموونەیی دەبینرێ لە وڵاتانی دووری هێزی نزم».

## زیانەکانی ڕابەریکردنی هاوبەش

زۆر کەم لە زیانەکانی ڕابەریکردنی هاوبەش ئاماژەیان پێکراوە، لە چاپکراوانی بواری ڕابەریکردن ئاماژە بەوە کراوە کە لە کاتێکدا کۆمەڵێك لە ژێردەستە بەشدارییان پێدەکرێ لە بڕیاردان، ئەوا گەیشتن بە بڕیار زۆر لەسەرخۆ دەبێ. ئەوەش دەبێتە هۆی بەفیڕۆچوونی کات، چونکە ڕازیبونی هەموو بەشداربووان  لە ئامانجی بەشداری پێکردنەکەیە. بەمەش کاتێکی زۆرتری دەوێ لە بڕیاردانی یەك لایەنە، کاتێ خەڵکانێکی زۆر بەشدارییان پێدەکرێ. لە هەمان کاتدا کاتێ بڕیاردانەکە بە بەشداری هەموو ئەندامانی کۆمەڵەکە دەبێ ئەوا کەسی بەرپرس بۆ سەرزەنشت کردن دیارنامێنێو چاوپۆشی لە هەڵە دەکرێ. بە شێوەیەکی تر چاوپۆشی لە هەڵە دەکەن کە لە سەرەتا هەموو کۆمەڵەکە بەشدارییان کردووە لە بڕیارەکە یان ئامانجە دیاریکراوەکە، یان گۆڕانە نوێیەکە، (وێبگەی دیسیژن مەیکینگ). یوکل (١٩٩٤) ئەوە شیدەکاتەوە کە ئەگەر بەشداریکردن بەرەو بڕیاری ڕاستەقینە ئاڕاستە ناکرێ ئەوا کات بە فیڕۆ دەدرێ لە بابەتی لابەلا کە لەلایەن ژێردەستەکانەوە بەرزدەکرێتەوە. قازانجو ئەولەویاتی کەسی لەوانەیە بڕیاردان بگەیەنێتە کۆتاییەکی داخراو. بە پێچەوانەی بیرۆکەی چاوپۆشین لە سەرنەکەوتن، پێیوایە کە ڕابەریکردنی هاوبەش لەوانەیە ببێتە کەمبوونەوەی متمانە بە خۆبونو زیادکردنی ترسو پاڵەپەستۆی کۆمەڵ لەسەر تاك، چونکە جێبەجێکردنی ئامانجی هاوبەش بریتی دەبێ لە ئەرکی هەریەکە لەژێردەستەکان بەرامبەرکۆمەڵەکە. لە کاتێکدا ڕابەریکردنی هاوبەش ململانێ کەم دەکاتەوە لە نێوان بەشداربووان، لەوانەیە کێبڕکێش کەم بکاتەوە (ئەرگیریس، ١٩٥٥). زیانێکی دەروونی لە لایەن مولدێر (١٩٧١) ئاماژەی پێکراوە، گریمانەی لە دەست دانی سەربەخۆی کەسییەتی هەیە. کاتێ بەڕێوەبەر ئاراستە دەدات بەژێردەستە، ژێردەستە دەتوانێ بەرهەڵستی بەڕێوەبەر بکات، چونکە بەرهەڵستی یەك کەس دەکات. بەڵام کاتێ هەموو کۆمەڵەکە بەشداری دەکات، کاریگەری کۆمەڵ هیچ بوارێك بۆتاکە کەس جێ ناهێڵێ بۆ بەرهەڵستی، کردن. فەرمانبەر دەبێ پەیوەست بێ بە بڕیارەکە. لە ئەنجامدا، لە دەستدانی سەربەخۆیی کەسی کێشەی دەروونی دروست دەکات لە بۆ تاکە کەسەکە.

لەکۆتاییدا، ڕابەریکردنی هاوبەش شایەنی پراکتیزەکردنە لە لایەن بەڕێوەبەرانەوە، چونکە زۆر سودی هەیە. بەڕێوەبەران دەبێ بزانن کە کێ بەشداری پێدەکەن لەپرۆسەکە، پێش هیچ دەست پێشخەرییەك لەبۆ ڕابەریکردنی هاوبەش. لە چەندان لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە کە ئەگەر بەکاربهێنرێ لەگەڵ ژێردەستانی نەخوێندەوار یان ئاست نزم لە بواری ڕۆشنبیری ئەوا ئەو بەرهەمە نادات کەبۆی بەکار دەهێنرێ. واتا زۆر کاریگەری خراپی دەبێ کاتێ لەگەڵ ژێر دەستەی ئاستی رۆشنبیر نزم بە کاردەهێنرێ، چونکە بواری ئیستغلال کردنی بەڕێوەبەر لە لایەن ژێر دەستە زیاد دەکات. دواخاڵ، ئەو شێوازەی ڕابەریکردن زۆر گونجاوە بۆجێبەجێ کردنی گۆڕان لە ڕێکخراو. لە جیهانی ئەمڕۆدا کە گۆڕان بریتییە لە بەشێکی لکاو لە هزری بازرگانی، دەتوانی کاریگەری گۆڕانی ترسناكو گرنگ کەم بکەینەوە لە ڕێکخراو بە بە شداری پێکردنی ژێردەستەکان کە چۆن مامەڵە لەگەڵ گۆڕانەکە بکەنو جێبەجێی بکەین. ڕابەر دەتوانێ پەنا بباتە بەر ڕابەرایەتی ئاراستە کردن کاتێ قازانجی کەسی ژێردەستە بڕیاردانی کۆمەڵی بەرەو کۆتاییەکی داخراو برد.

بەشی یەکەم



# سپاردنی دەسەڵات... ئامرازێك بۆ گەشەپێدانی کارگێڕی

ئا/عومەرعەبدولقادر

* چەمکی دەسەڵات سپاردن:

مەبەست لە دەسەڵات سپاردن دەست هەڵگرتنی سەرۆك کار یان بەڕێوەبەرە لە بەشێك لە دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردنو جێهێشتنی بۆ یاریدەدەرەکەی یان جێگرەکەی، یان هەر فەرمانبەرێکی تری دامەزراوەکەی لە خوار پلەکەی خۆیەوە·

لەبەرئەوەی کاتو توانای بەڕێوەبەر تا رادەیەکی دیاریکراوە، بۆیە ناکرێت هەموو ئەرکەکانی دامەزراوەکە هەر لە وردەکاری بڕیارەکانو بە دواداچوونی جێبەجێ کردنیانو بە جێهێنانی سەرجەم کاروبارەکان لە ئەستۆی بەڕێوەبەردا بێت، لەبەرئەوە پێدانی بەشێك لە دەسەڵاتی جێبەجێ کردنی بەڕێوەبەر بە یاریدەدەر یان فەرمانبەرانی تر کارێکی پێویستە، ئەمەش بە ئامانجی بەشداری کردنی کارای فەرمانبەران لە ئەنجامدانی کارەکان بە لێهاتوویی‌و لە کاتی دیاریکراوو گونجاوی خۆیدا·

دەسەڵات سپاردن متمانە بەخشینە بەکەسانی تر، بەڕێوەبەران بەم کارەیان دەرفەتێك بەو کەسانە دەدەن تاکو ئاستی زانیاری‌و کارامەیی‌و شارەزاییان بەرز بکەنەوەو ئەزموون لەو پرۆسەیە وەربگرنو باشتر لە ئەرکو پیشەکەیان تێ بگەن، سەرەڕای ئەوەی کە کاتێکی زۆر دەگەڕێنێتەوە بۆ بەڕێوەبەر تا لە ئەنجامدانی ئەو کارانەدا بەرێبخات کە ناتوانرێت دەسەڵاتی بەجێهێنانیان بە کەسی تر بسپێردرێت·

دەسەڵات دان بە کەسانێك کە بەسەرکەوتوویی‌و بە باشی کارەکانیان ئەنجام دەدەن هەست بە گرنگی پێدانیانو گەشەکردنی تواناو لێهاتووییان دەکەنو دەبێتە فاکتەری هاندانو ئامادە سازییان بۆ لە ئەستۆ گرتنو ئەنجامدانی هەرکارو پرۆژەیەکی تر لە داهاتوودا·

لەگەڵ ئەوەی ئەم پرۆسەیە بە کارامەییەکی کارگێڕی بە نرخو گرنگ دادەنرێت، بەڵام زۆرجار ئەم پرۆسەیە لە دامەزراوەکاندا پشتگوێ خراوە یان بە رێگەو شێوازێکی شێواوو نادروستو بەبێ بیرکردنەوەو پلان دانان ئەنجام دەدرێت ئەمەش دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە دامەزراوەکە زیاتر لەوەی سوودی هەبێت·

مەرجەکانی دەسەڵات سپاردن:

بۆ ئەوەی پرۆسەی دەسەڵات سپاردن بەشێوازێکی کاراو بە سەرکەوتوویی ئەنجام بدرێت، پێویستە رەچاوی ئەم مەرجانە بکرێت:

١- لەبەرچاوگرتنی پەیکەری رێکخستن، دەبێت دەسەڵات سپاردن بە پێی رەچاوکردنی پۆستو پلەی رێکخستنی کارگێڕی ئەنجام بدرێت، واتە دەسەڵات لە بەڕێوەبەرەوە دەسپێردرێ بە کەسانێك کە لە خوار پلەی بەڕێوەبەرەوەن·

٢- دیاریکردنی ماوەی دەسەڵات سپاردنەکە، واتە سەرەتای دەستپێکردنو کاتی کۆتایی هاتنی پرۆسەکە دیاری بکرێت·

٣- ئامادەکردنی زانیاری تەواو دەربارەی چوارچێوەی دەسەڵات سپاردنەکەو ئاستی دەست رۆشتوویی‌و رادەی بڕیاردانی کەسی دەسەڵات پێدراو و شێوازو چۆنیەتی بە ئەنجام گەیاندنی پرۆسەکە، ئەمەش دەبێت بە دەقێکی نوسراوو بەشێوەیەکی یاسایی رێکبخرێت·

٤- بەفەرمی ئاشکراکردنی دەسەڵات پێدانەکەو ناساندنی کەسی دەسەڵات پێدراو بەو فەرمانبەرانەی کە کارەکەیان دەکەوێتە سنوری پرۆسەکەوە·

هەروەها کاتێك وەك بەڕێوەبەرێك بەشێك لە دەسەڵاتەکانت دەدەیت بە کەسێکی دیاریکراو، بە مەبەستی زیاتر سەرخستنی پرۆسەکە پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکە:

١- پەلەنەکردن: بە پەلە مەبە لە سپاردنی کارەکە بەو کەسە، تا بە تەواوی ئەو هەنگاوانەی بۆ روون دەکەیتەوە کە پێویستن بۆ ئەنجامدانی کارەکە بە سەرکەوتوویی·

٢- پێنەدانی رێنمایی کەموکورت: تا بەتەواوی دڵنیا نەبیت لە راستو دروستی‌و رێکوپێکی زانیارییەکانو پلانو بەرنامەی ئەنجامدانی کارەکە، پرۆسەکە بە کەسی دیاریکراو مەسپێرە، چونکە پشتگوێ خستنی هەر شتێك یان زانیارییەك لەوانەیە ببێتە هۆی شپرزە بوونو سەرلێشێوانی ئەو کەسەو شکست هێنانی پرۆسەکە·

٣- پشتگوێ نەخستنی ترسو دڵە راوکێ: بە باشی گوێ بگرە بۆ پرسیارو سەرنجو تێبینیەکانی کەسی دەسەڵات پێدراو، هەوڵبدە لە میانی قسەکانیدا بزانیت ترسی لە چ شتێکی کارەکە هەیە، تا زیاتر بۆی روون بکەیتەوەو هاوکاری بکەیت·

٤- لە خۆوە دەسەڵات نەدان بە هیچ کەسێك: دەسەڵاتی ئەنجامدانی کارەکان بەکەسێك بسپێرە کە توانای دانانی نەخشەیەکی وردو کات بۆ دانراوی هەبێت، کارەکە یاخود پرۆسەکە بە لێهاتوویی‌و بەباشی بە ئەنجام بگەیەنێتو لەکاتی دیاریکراودا پێت بسپێرێتەوە·

٥- وا مەزانە کە شێوازی تۆ تاکە شێوازی ئەنجامدانی کارەکە بێت:

دوو دڵ مەبە ئەگەر فەرمانبەرەکەت رێگەیەکی جیاواز لە تۆ بگرێتە بەر، بە تەواوی فەرمانبەرەکەت سەربەست بکە لە هەڵبژاردنی ئەو شێوازو رێگەیەی کە بە باشو گونجاوی دەزانێت بۆ ئەنجامدانی کارەکە، بە مەرجێك تواناو دەرامەتی زیاد لە پێویست بە کارنەهێنێتو لەکاتی دیاریکراو زیاتر نەخایەنێت·

٦- دروست نەکردنی وێنایەکی خراپو نادروست دەربارەی خۆت: ترست لەو کارە نەبێت کە ئەنجامت داوە، زوو بە دەم کێشەکانەوە بچۆو چارەسەریان بکە تا زیاتر لێت ئاڵۆز نەبنو زۆر سەرقاڵت نەکەن·

# جۆری کەسایەتیت بناسە

و/هەلمەت فوئاد

یەکەم/ لە قسەکردندا:

١- خێرام، ٢- مام ناوەندم، ٣- هێواشم.

دووەم/ زۆر باشم لە بە یاد هاتنەوەی:

١- کەسەکان، شێوەی روو، بارودۆخەکان؟

٢- ئەوەی دەوترێ، دەنگەکان، ناوەکان؟

٣- رووداوەکان، بەسەرهاتەکان، هەڵچوونە سۆزدارییەکان؟

سێیەم/ دەرخکردنی شتەکان لە یادگاتدا بە هۆی:

١- دووبارەکردنەوەی نووسینە؟

٢- دووبارەکردنـــەوەی قســـە بـــە دەنگی بەرز؟

٣- بە هاتووچۆکردنی بەردەوام؟

چوارەم/ کام لەوانـــە ســـەرنجت رادەکێشێت؟

١- بارودۆخ؟ ٢-دەنگ؟ ٣- جووڵە؟

پێنجەم/ کاتێـــک قســـەیەکی ناشـــیرین دەردەبڕیت ئایا:

١- وشەکە لە خەیاڵتدا وێنا دەکەیت؟

٢- دەنگت بە وشەکە بەرزدەکەیتەوە؟

٣- وشەکە دەنووسیتەوە؟

شەشـــەم/ پێت خۆشە لە کاتی پشووداندا چی بکەیت؟

١- گۆڤارێکی وێنەدار بخوێنیتەوە؟

٢- گوێ لە مۆسیقا بگریت؟

٣- بحەسێیتەوە؟

حەوتـــەم/ کاتێ دەتـــەوێ ئامێرێك بە یەکتر ببەستیتەوە:

١- بـــە دوای رێنماییەکانـــی کەتەلۆکـــی ئامێرەکەدا دەچیت؟

٢- حەز دەکەیت کەسێك رێنماییت بکات؟

٣- حەز دەکەیت خۆت کارەکە بکەیت؟

هەشتەم/ چۆن قسە هەڵدەسەنگێنیت؟

١- وا پێدەچێت باش بێت؟

٢- بەباشی گوێ دەگرم؟

٣- هەست دەکەم کە باشە؟

نۆیەم/ کاتێك دەخوێنیتەوە ئایا:

١- پێـــت باشـــترە خـــۆت بۆخـــۆت بخوێنیتەوە؟

٢- لێـــوت بجوڵێنیـــت کاتێـــك دەخوێنیتەوە؟

٣- بـــە پەنجەکانت دوا بە دوای دێڕەکان بڕۆیت؟

دەیـــەم/ کاتێـــك بیـــر لە کەنـــاری دەریا دەکەیتەوە سەرەتا بیردەکەیتەوە لە:

١- وێنەی دەریاو کەنار دەکەیتەوە؟

٢- دەنگی شەپۆل و هاژەی دەریا؟

٣- هەســـت بـــە وردەبـــەردی ژێـــر پێت دەکەیـــت لە کەنـــار دەریـــاو هەروەها بۆنی کەمەندکێشی دەریا؟

یازدەهـــەم/ کاتـــێ دەچیـــت بـــۆ ژووری نووستن گرنگتر لە لات ئەوەیە:

١- ژوورەکە تاریك بێت؟

٢-ژوورەکە ئارام بێت؟

٣- پێخەفەکە نەرموخۆش بێت؟

ئەنجام/

ئەگـــەر زۆرترینی وەڵامـــەکان لە وەڵامی ژمـــارە (١) بێـــت، ئـــەوا تۆ کەســـێکی توانای بینینت زۆرترە.

ئەگـــەر زۆرترینی وەڵامـــەکان لە وەڵامی ژمـــارە (٢) بێـــت، ئـــەوا تۆ کەســـێکی توانای بیستنت زۆرترە.

ئەگـــەر زۆرترینی وەڵامـــەکان لە وەڵامی ژمـــارە (٣) بێـــت، ئـــەوا تۆ کەســـێکی توانای هەستکردنت زۆرترە.

ئەوەتـــان لە بیر نەچێت هـــەر گروپێك لەم سێ جۆرە، تایبەتمەندی خۆی هەیە هیچ گروپێك باشتر نییە لە گروپەکەی تر.

## خەندەی کارگێڕی



## ئۆتۆمبیلەکەیان دزیوم!

ئافرەتێکـــی بـــە ســـاڵاچوو بە شـــین و گریانەوە، پەیوەندی بە پۆلیسی ئێشکگرەوە کـــردو پێـــی وتـــن: (ئۆتۆمبیلەکەیـــان دزیـــوم! دزەکان هەڵیـــان کوتاوەتە ســـەر ئۆتۆمبیلەکـــەم و هەرچییەکـــی تێدابووە، دزیویانە).

ئەو پۆلیسەی وەڵامی پەیوەندییەکەی دایـــەوە، داوای لێکـــرد هێـــور ببێتـــەوەو ئارامبگـــرێ، بـــە روونـــی رووداوەکـــە بگێڕێتەوە، چونکە لەبەر دەنگی گریان بە تەواوی حاڵی نەدەبوو لە داواکەی.

ئافرەتەکـــە وتی: (ئامێری تەســـجیل و رادیۆ، ســـوکان، ئیستۆپ، جێ پێی بەنزین، جامـــی پێشـــەوەو ئاوێنـــەکان، تەنانـــەت گێرەکەشیان دزیوە)!!!

پۆلیســـەکە پێـــی وت: (خانمەکـــەم لەسەرخۆبە، لە ماوەی چەند خولەکێکدا، پۆلیســـێك دەگاتـــە لات، تا لـــە رووداوەکە بکۆڵێتەوە).

کاتێـــك پۆلیســـەکە گەیشـــت، بـــە سەرسامییەکی ئێجگار زۆرەوە ســـەیری ئۆتۆمبیلی ئافرەتەکەی کرد، ســـەیری کرد هیچ شتێك لە نێو ئۆتۆمبێلەکە نەدزراوە، پەیوەندی بە بنکەی پۆلیســـی ئێشکگرەوە کـــردو وتی: «ئەو خانمە بە هەڵە چووەتە نـــاو ئۆتۆمبیلەکەیەوە، ئەویش لە دەرگای دواوەوە»!

ئەتیکێتی منداڵان

## منالێک باسی خۆی دەکات

# پارێزگاری لە پاکوخاوێنی ماڵەوە

منداڵان وەکو دەبینین رۆژانە لە ماڵەوە دایکمان زۆر ماندوو دەبێت، تاکو بتوانێت ماڵەوە جوانو قەشەنگ بکاتو بە پاکوخاوێنی رایبگرێت، لەبەرئەوە:

* من کاتێك لە ماڵەوە کاغەزێك بەکاردەهێنمو لەدواییدا کارم پێی نابێت، ئەوا هەر لەو شوێنەدا فڕێی نادەمو بەجێی ناهێڵم، بەڵکو دەیخەمە ناو سەبەتەی زبڵەوە.

* هەروەها بە هەمان شێوە کاتێك لە کاتی پێویستدا دەستەسڕی (کلێنێکس) بەکاردەهێنم، لە پاشاندا دەیخەمە ناو زبڵدانەوە.

* من کاتێك لە ماڵەوە بسکویت یان میوەو شیرەمەنی سوودبەخش دەخۆم، دەیخەمە سەر سینیەك، ئەمەش بۆئەوەی نەرژێنە سەر قەنەفەو ڕایەخی ناو ماڵەوە.

* من لەدوای نانخواردن دەستو دەمم بە باشی دەشۆمو تاکو دەستەکانم خاوێن نەبێت دەستکاریی جلوبەرگەکانم ناکەم.

* کاتێك لە دەرەوە دەگەڕێمەوە ماڵەوە، یەکسەر پێڵاوەکانم دادەکەنمو لە شوێنی پێڵاوەکان دایدەنێم، تا ماڵەوەمان پیس نەبێت.

* کاتێك جلوبەرگەکانم دەگۆڕم، فڕێیان نادەمە سەر زەوی، بەڵکو ئەوەی خاوێن بێت لە شوێنی تایبەتی خۆیان دایاندەنێمو هەڵیاندەواسم، ئەوەی چڵکن بێت دەیانخەمە ناو سەبەتەی تایبەت یان ئامێری شووشتنی ماڵەوە.

* من هەموو شەوێك دوای تەواوکردنی وانەو ئەرکەکانی قوتابخانەم، هەر خۆم کتێبو دەفتەرەکانم ڕێکدەخەمەوەو ئەوانەی پێویستن لەناو جانتاکەم دایان دەنێم.

* لەو کاتانەی لە ماڵەوە یاری بە یارییەکانم دەکەم، دوای تەواوبوون لە یاری، بە جوانی هەڵیاندەگرمەوەو دەیانخەمەوە ناو شوێنی تایبەتی خۆیان.

*پارێزگاریکردن لە کەلوپەلەکانی ناوماڵ:

منداڵان، ئێمە بە هەمان شێوە دەبینین باوکمان، زۆر تێدەکۆشێتو ماندوو دەبێت لە پێناوی بەدەستهێنانی بژێوی ڕۆژانەو کڕینو دابینکردنی شمەكو کەلوپەلە جوانەکانی ماڵەوە، بۆیە لەسەر ئێمەی منداڵیش پێویستە ئەم ماندووبوونەی باوکمان لەبەرچاو بێتو پارێزگاریی لە کەلوپەلەکان بکەین:

* من هەرگیز مێزو کورسیو قەنەفەکان پیس ناکەمو لەسەریان نانووسم، هەروەها لەسەر قەنەفەکان هەڵناپەڕم هەروەك چۆن هەندێك منداڵ لە ماڵی خۆیانو لە ماڵانی تریش ئەم کارە قێزەونە ئەنجام دەدەن.

* من یاری بە پەردەکانو کەلوپەلەکانی تری ماڵەوە ناکەم.

* من بە وریایی کەلوپەلی لە شووشە دروستکراو بەکاردەهێنم تاوەکو نەشکێن، هەروەها لەناو ماڵدا یاری بە تۆپ ناکەم.

* لەکاتی پێویستدا بە نەرمی دەرگای سەلاجە دەکەمەوەو دایدەخەمەوە.

* هەروەها ئامێرەکانی تری وەکو تەلەفزیۆن، تەلەفۆن، رادیۆ، کۆمپیوتەرو هەر ئامێرێکی تری کارەبایی زۆر بە ئاگاداری بەکاردەهێنمو پارێزگارییان لێدەکەم.

س/ دلیل السلوك المتميز.

گۆشەی زانیاری

ئا: خوناو محەمەد

# ئەسپی ڕووبار و ئەسپی دەریا



یەکێك لە شتە نامۆکانی جیهانی دەریاو ڕووبارەکان، بوونی دوو جۆرە لە دروستکراوەکانی خوای گەورە کە هەردووکیشیان بە ئەسپ ناونراون، بەڵام جیاوازییان جێگەی سەرسوڕمانە، ئەسپی ڕووبار ئاژەڵێکی زەبەلاحەو درێژی نێرەی پێگەیشتوو نزیکەی (٣-٤) مەترو بەرزییەکەی تاکو سەر شانەکان نزیکەی مەترێكو نیوە، کێشەکەشی دەگاتە ٤ تەن. بەچکەی ئەسپی ڕووبار دوای ماوەی سکپڕی ٢٤٠ ڕۆژ لە سکی دایکیدا لەدایك دەبێت، کاتێکیش بەچکەکە لەدایك دەبێت درێژییەکەی مەترێكو کێشەکەی ٤٨ کیلۆگرامە، دایکەکەی سەرپەرشتی دەکات تاکو دەگاتە قۆناغی پشت بە خۆبەستن لە دوای دوو ساڵدا، بەڵام ئەسپی دەریا زیاتر لە ٥٠ جۆری هەیە، بە شێوەو ڕواڵەتە جوانەکەی جیادەکرێتەوە، درێژییەکەی لە (١٧) سانتیمەتر زیاتر نابێت، کێشەکەشی کیلۆو نیوێك دەبێت. چۆنیەتی زاوزێو زۆربوونی ئەسپی دەریا زۆر سەیرو نامۆیە، مێینە هێلکە پیتێنراوەکەی لە ناو بۆڕییەکی ناو سکی نێرینەکەی دادەنێت، ئەویش هەڵیدەگرێت تاکو دەتروکێت، ئینجا بەچکەکان لە دەمییەوە دێنەدەرەوە، وەك ئەوەی نێرینەکە بەچکەی بووبێت لەجیاتی مێینەکە!

سەرچاوە: گۆڤاری (ماجد) ژمارە (١٦٥) ساڵی ٢٠٠٩.






## هونەرو زانستو وەرزشە

منداڵان، شەترەنج یارییەکە پێویستی بەبیرکردنەوەو وردبوونەوە هەیەو یەکێکە لە یارییە بە ناوبانگەکانی جیهان. ئەم یارییە لەسەر تەختەیەکی دابەشکراو بەسەر ٦٤ چوارگۆشەدا ئەنجامدەدرێت، (٨ چوارگۆشە × ٨ چوارگۆشە)، چوارگۆشەکان بەسەر دوو ڕەنگی (ڕەشو سپی) دابەشکراون، بەشێوەیەک چوارگۆشەیەک ڕەنگی ڕەشەو تەنیشتەکەی ڕەنگەکەی سپییە. هەر یاریزانێک (١٦) بەرد یان (ئالەت)ی هەیە، هەر یەکێکیان بە چەند ئاراستەیەکی دیاریکراوی تایبەت بە خۆی دەجووڵێتەوەو بریتین لە: (٨ سەرباز، ٢ قەڵا، ٢ ئەسپ، ٢ فیل، لەگەڵ وەزیرێکو پاشایەک).

لە سەرەتادا یەک لە یاریزانەکان کار بە بەردەکانی ڕەنگی یەکەم (سپی) دەکاتو ئەوەی تریان کار بە هەمان بەردەکانی بەرامبەر لە ڕەنگی (ڕەش) دەکات. ئامانج لە یاری شەترەنجدا چواردەورگرتنی (پاشا)ی هێزی بەرامبەرە، بە شێوەیەک کە نەتوانێت دەربچێتو لەم خاڵەدا یارییەکە کۆتایی پێدێت.

یاری شەترەنج وەکو جەنگێکە لە نێوان دووسوپاو سەربازگەی هاوسەنگ لە هێزدا، سەربازگەیەکی سپیو سەربازگەیەکی ڕەش. ئامانجی هەر سوپاو سەربازگەیەک بە دیلگرتنی (پاشا)ی سوپاو سەربازگەکەی تریانە، ئەمەش بە ناچارکردنی پاشا بۆ خۆ بەدەستەوەدان، ئەم بارەش لە جووڵەی کۆتاییدا پێی دەگوترێت: (کش مات)، هەر لایەنێکیش پاشایەکەی بە دیل بگیرێت بە دۆڕاو دادەنرێت. شەترەنج یەکێکە لە یارییە زۆر بڵاوەکان لە جیهانداو بەمەش وەسفکراوە کە تەنها یاری نییەو بەس، بەڵکو هونەرو زانستو وەرزشە. زۆر لە وڵاتان خۆیان بە داهێنەرانی یاری شەترەنج دادەنێن، بڵاوترین بیروڕاش ئەوەیە کە بۆ یەکەمجار لە وڵاتی (هیند) سەری هەڵدابێت.

سەرچاوە/ئینتەرنێت-ویکیبیدیا.

بە مەبەستی پەروەردەکردنی نەوەیەکی خاوەن بڕیار، بۆئەوەی منداڵەکانمان لە سەرەتای ژیانیانەوە لەسەر کارگێڕیو ڕێکخستنو شارستانییەت پەروەردەبن، بەشێکی نوێمان لە گۆڤارەکەدا بە ناونیشانی (بڕیاری منداڵان) کردەوە بەو هیوایەی لە داهاتوودا ببێتە گۆڤارێکی سەربەخۆ.

جا هەر بەڕێزێکی قەڵەم ڕەنگین ئارەزووی بەشداری دەکات با بابەتەکانی ئاراستەی ئەم گۆشەیە بکات لە ڕێگای بەڕێز: موحەمەد مێرگەیی یەوە بەم ئیمەیڵەی خوارەوە...
muhamada4@yahoo.com

بەڵام پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکەن کە ئەم بەشە جیاوازە لە بەشی پەروەردەو نوسینەکانی (بڕیاری منداڵان) ڕاستەوخۆ ئاراستەی منداڵان دەکرێت نەک پەروەردەکاران.




# بوارەکانی زانینی بازاڕسازی

م/ هاژە شێروانی

بەشی حەوتەم و کۆتایی

## چوارەم: ناسینی ڕکابەر
## Competitor Knowledge

لەگەڵ خێرایی فراوانبوونی دیاردەی جیهان گەرایی بازاڕەکانی جیهان زۆرتر کرانەوەو تەواوکارییان بە خۆوە بینی، جیهانیشی بەبێ سنوور کرد، ئەمەش دوای ئەوەی کە تەکنیکی زانیاریو گەیاندن ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا لە زیادکردنی توندی ڕکابەری کردنو دەستخستنی گۆڕینی ڕەگو ریشەیی لە بازاڕ لە پێشکەش کردنی بەرهەمە تەقلیدییەکان.

ڕکابەران بەشێکن لە بازاڕو بەشێکن لە جیهانەکەی، کە دەستنیشانی جۆرو ڕێگاکانی مامەڵەکردن دەکەن لە گەڵیانداو کاریگەریان دەبێت لە سەر توانای وەرگرتنی بە چەندو چۆنایەتی، لەگەڵ تێبینی کردنی ئەو کاتەی کە ڕکابەری نییە، لێرەدا چاودێری ڕکابەران پێویست نییە، بەهەرجۆرێك بێت لە کاتی ڕکابەری بەرفراوانو کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر ڕکابەران بە کارێکی گرنگ دادەنرێت، لە بەر:

١- ڕکابەری بەرفراوان کار دەکات بۆ دڵنیانەبوون لە سەر بازاڕ نەتوانینی پێشبینی کردن، لەوانەشە چاودێری ڕکابەران یارمەتیدەر بێت بە شێوەیەکی باشتر بۆ پێشبینی کردن بەو گۆڕانکاریانەی کە لە ستراتیژییەکانی بەرهەمی نوێی ڕکابەران ڕوودەدەنو لە دوایشدا کەمکردنەوەی نەتوانینی بە پێشبینی کردنی بازاڕ.

٢- لەگەڵ ڕکابەری بەرفراوان ناسینەوەی بەرهەمو پشکی بازاڕ کاریگەرتر دەبن بە گۆڕانکارییەکانو فەرامۆش کردنی ڕکابەران لەوانەیە کاربکات بۆ هاندانو شیرین کردنی پێگەی بازاڕی ڕێکخراوەکەمان.

کەواتە دەتوانین پێناسەی ناسینی ڕکابەر بکەین بەوەی کە بریتیە لە توانای دەستخستنو لێکدانەوەو تەواو کردنی زانیاری پەیوەندیدار بە ژینگەی ڕکابەری جیهانی، هەروەك پرۆسەی زانینی ڕکابەران یەکێکە لە پسپۆڕییەکانی زانینی بازاڕو پێویستی بە جیاکەرەوەی سەرەکی هەیە بۆ سەرکەوتن لە بازاڕی جیهانی، پێشبینی دەکرێت کە کاردانەوەی پۆزەتیڤی هەبێت لە سەر ئەدای ڕێکخراو.

لێرەدا کۆمەڵێك هەنگاو هەن کە ڕێکخراو لە ڕێگایەوە دەتوانێت مامەڵە لەگەڵ ڕکابەرەکانی بکات، لە هەمان پیشەسازی ڕێکخراو، ئەوانیش:

١- ناسینی ڕکابەران.
٢- دیاریکردنی ستراتیژییەکانی ڕکابەران.
٣- ناسینی خاڵی هێزو لاواز.
٤- هەڵسەنگاندنی شێوەکانی هەڵسوکەوتە جیاوازەکانی ڕکابەران (کاردانەوەیان).
٥- هەڵبژاردنی ئەو ڕکابەرانەی کە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت.
٦- کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر ڕکابەران.

کەواتە دەتوانین بڵێین: کە تاوەکو زانینی ڕێکخراو سەبارەت بە ڕکابەران زیاد بکات ناسینەوەی بۆ ڕکابەران زیاتر دەبێتو پێگەیەکی ڕکابەری باش دەستە بەر دەکات، لەم ناسینەوانەی کە ڕێکخراو سوودمەند دەبێت لێی بۆ زیادکردنی زانینی ڕکابەرییان:

١- ڕێکخراو هەڵدەستێت بە ناسینەوەی ڕکابەریو ئەو هۆیانەی کە وای لە کڕیارەکان کرد کە بەرهەمەکانی بکڕن لە بری ئەوەی کە بڕۆنە ڕێکخراوە ڕکابەرەکان، لە دوایدا ڕێکخراو دەتوانێت کە ئەم خاڵە بقۆزێتەوە بە مەبەستی ڕاکێشانی زۆرترین ژمارە لە کڕیاران بۆ کڕینی بەرهەمەکانی.

٢- لە ژێر ڕۆشنایی زانینی کەڵەکە بوو لە لای ڕێکخراو لە سەر ڕکابەران، دەتوانێت ئەو دەرخستانەی کە ڕکابەران پێشکەشی دەکەن شیان بکاتەوەو ئایدیا نوێیەکان دەست بخات سەبارەت بە چاکسازی بەرهەمەکانی.

٣- لە دوایدا دەتوانێت چینێکی کڕیاران بدۆزێتەوە کە ڕکابەران پێداویستیەکانیان پڕنەکردۆتەوەو لێرەدا ڕێکخراو دەتوانێت ڕەزامەندییان دەستەبەر بکاتو پێگەیەکی باشیش دابین بکات.

٤- زانینی ڕێکخراو بە بازاڕەکەی زیاد دەکات ئەگەر تێبینی هەڵسوکەوتی هەندێك ڕکابەرانی بکات، وەکو هەڵسانی ڕکابەری سەرکەوتوو بە دابەزاندنی نرخەکانی لە کاتی وەرزێکی دیاریکراو، کە پێچەوانەی ئەو زانیارییانەیە کە لە خوڕەوشتی خەرج کردن هەیە لەم بازاڕەدا.

بەرەو پێشکەوتن

ئا/ ئیبراهیم مستەفا خدر

بەشی دووەم

# شۆردنەوەی دراو بەرهەمی ئابووری نالەبار!

ئەگەر ئامارێك لە واتای شۆردنەوەی دراو لە ناو کۆمەڵگا وەربگرین زۆربەیان وشەی "نازانم" بەکاردەهێنن، ئەو وەڵامە لە لایەن خەڵکەوە یەکێك لە کێشەکانی دەوڵەتە بەرامبەر بەو تاوانەی کەوا چاوەڕوان دەکرێت بە بێ قوربانییە· شۆردنەوەی دراو لە ناو مێشکی ئێمە هیچ حاڵەتو ڕووداوی ناخۆشی نییە، وەك ڕووداوەکانی ئۆتۆمبێلو دزی نییە· ئەوەی کە خەڵکی ئێمە زانیاریان نەبێت لەسەر ئەم دیاردەیە زۆر بە ئاسایی لە قەڵەم دەدرێت، بەڵام هەر ئەمەشە کە بۆتە هۆی چارەسەرنەکردنی·

لە ئابووریو ڕامیاری زۆربەی وڵاتان ئەم دەستەواژەیە بەرچاومان دەکەوێتو زۆرجار دەنگی پشتگیری کردن لەم دیاردەیە لە پەرلەمانی وڵاتان دەکەوێتە نێو بابەتی لێکوڵینەوەو باس کردن، کەواتە بەڕاستی دەبێ پێداچوونەوەیەك بکەین کە شۆردنەوەی دراو چ دیاردەیەکە؟ بە چ هۆکارو میکانیزمێك کار دەکات؟ ئەگەر باوەڕبکەین شۆردنەوەی دراو دیاردەیەکی زەرەرمەندو نالەبارە بۆ ئابووری وڵات دەبێ ڕێگاکانی پشتگیریو چارەسەرکردنی بزانین؟

لە کۆتایی شەستەکانو سەرەتای حەفتاکان زاراوەیەکی نوێ هاتە ناو ئەدەبی ئابووری، ئەم چەمکە ناوی شۆردنەوەی دراوی لێنرا· شۆردنەوەی دراو یا خود شوشتنی پارەی پیس، بە تەواوی وەك فێڵو حیلەیەك بۆ بەدەستهێنانی سەروەتو سامان لە قەڵەم دەدرێت·

شوشتنی پارە، واتە پارەی نائاساییو پیس دەکەوێتە بەردەستو دەگۆڕدرێت بۆ پارەیەکی پاكو حەڵاڵ بە شێوەیەك کە لە کۆتاییدا دەچێتە چوارچێوەی پارەی یاسایی· بە شێوازێکی تر سەرچاوەی ئەو پارانە کە بە شێوەی نائاسایی بەدەست دێن لە ئەنجامی ڕیزبەندو گواستنەوەو مامەڵە کردنێك بە نەزانراوی دەمێنێتەوە بە شێوەیەك کە لە کۆتاییدا، دەکرێ پارەکان هەروەك داهاتێکی یاسایی تەماشا بکرێت·

شۆردنەوەی دراو دیاردەیەکە کە تێیدا بڕە پارەیەکی زۆر کە لە کارەکانی نایاسایی وەك کردەوە تیرۆرستییەکان بەدەست دێت بە شێوەی پارەو دراوی یاسایی بە دیار بکەوێت· واتە شۆردنەوەی دراو ئاسانکارییەکە بۆ بەدی هێنانی ئامانجی تیرۆریستو فرۆشیاری ماددە هۆشبەرەکانو ئەو کەسانە کە خۆیان دەشارنەوە لە پێدانی باج بە حکومەتو هەروەها ئەو کەسانە کە دەیانەوێ خۆیان دووربکەن لە چاوی کاربەدەستانو پیاوانی دەوڵەت کە سامانو سەروەتیان بە چ شێوازێك کۆ بۆتەوە، ڕۆڵی بەرچاوی هەیە·

شۆردنەوەی دراو پردێکە بۆ پڕکردنەوەی دووریو دروستکردنی پەیوەندی دونیای تاوانباران لەگەڵ خەڵکی ئاسایی یاخود خاڵی بە یەکبەستنەوەی پەیوەندی ئابوورییەکی یاساییو فەرمیە بە ئابوورییەکی نایاساییو نافەرمی·

نەتەوە یەکگرتووەکانو کۆمسیۆنە ئەوروپاییەکان بە چەند شێوازێك پێناسەی ئەم دیاردەیان کردووە وەك:

* گۆڕین یان گواستنەوەی دارایی بە زانینی ئەوەی کە ئەو جۆرە داراییە بۆ کرداری نادروستو تاوانبار دەگەڕێتەوە، بە مەبەستی دەست بەسەرداگرتنو شاردنەوەی سەرچاوەی نایاسایی دارایی یان هاوکاری کردنی لە لایەن کەسێك بە بەشداری کردن لەو تاوانە تاکو کەسێکی تر دووربخرێتەوە لە ئەنجامی کارە نائاساییەکانی·

* شاردنەوەو دەست بە سەرداگرتنی سەرچاوەو باری کەسایەتی، گواستنەوەی مافی پەیوەندیدار یاخود خاوەنداری ڕاستەقینەی دارایی لەگەڵ زانین بە ئەوە کە ئەم کارانە لە ئەنجامی کاری نایاسایی ئەنجام دەدرێت·

لە گۆشەنیگای ناوەندی لێکوڵینەوەی پارلەمانی ئەوروپی گەندەڵی ئابووریو دارایی بریتییە لە تەواوی ئەو کردارو ڕەفتارانە کە دەبێتە هۆی تێکچوونی ڕێسای ئابووریو نواندنی کاریگەری بەسەر دەرەنجامە گونجاوەکانی ناوەندە ئابوورییەکان لە ئاستە جیاوازەکان، لە یەکەیەکی بچوك تاکو شێواندنی ئابووری ئەو وڵاتە·

لەگەڵ ئەو ڕوون کردنەوانەی سەرەوە دەتوانین بڵێین: شۆردنەوەی دراو خراپ بەکارهێنانی پۆست، پلەو پایە، دەسەڵات، ڕێنماییو یاساکانە لە بەرژەوەندی کەسی· ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە شۆردنەوەی دراو بە سێ قۆناغدا تێپەڕ دەبێت·

یەکەم/ (چوونە ناوەوە) بە واتای یەککردنەوەو دانانی پارەکان· بۆ فروشیاری مادە هۆشبەرەکان کە پێنج ملیۆن دۆلار پارەی نەختینەیی بەدەست دەهێنێت، زۆر زەحمەت دەبێت کە ئەو بڕە پارەیە کە لە وانەیە زیاتر لەیەك ملیۆن کاغەزی پارەیە ناو حیسابی بانکی خۆی بکاتو ناچار دەبێ پەنا بە شۆردنەوەی دراو لە ڕێگای حیسابە بانکییەکانی تر، حەواڵە پۆستییەکان، چەكو پشکەکانی ناو بازاڕ ببات·

لە کاتی بەردەوام بووندا، قۆناغی دووەم دێت: واتە قۆناغی (پارێزگاری کردنی دراو) ئەو کاتە کەسی شۆردەر پەیوەندی خۆی لەگەڵ سەرچاوەی نایاسایی دەپێچڕێنێتو دەبێ ئەو پارەیە تا ئەو ڕادەیە کە دەتوانێت لە نێو حیسابەکان بباتو جوڵەی پێ بکات، ئەم کارەش لە ڕێگای ئەو کۆمپانیایانە دەکرێت کە بە شێوەیەکی تایبەت بەو مەبەستە لە هەموو دونیا دامەزراونو بە پشت بەستن بە سیستەمی نهێنی پارێزەری بانکەکانو نهێنی پەیوەندی پارێزەرو داواکار سەبارەت بە شاردنەوەی ناونیشانەکانیان، بە زانراوی تۆڕێکی ئاڵۆز لە گواستنەوەی دارایی پێك دەهێنن بە شێوەیەك کە لە هەر قۆناغێك دەبێ ڕەچاوی ئەو خاڵە بکات کە کاری سەرەکییەکەی سڕینەوەی شوێنو کاریگەری ژمێرکارییە واتە ڕەشکردنەوەی شوێنەواری کارەکان·

لە قۆناغی کۆتایی، قۆناغی (وشك کردنی پارە شۆردراوەکان) دێت بە واتای ئاسانتر گەڕاندنەوەو بەکارخستنی ئەم پارەیە· قۆناغێك کە پارە شۆردراوەکان دەبنە سەرچاوەی داهاتی یاسایی کە زۆرجار دەکەوێتە ژێر کاریگەری باجەوە، دێتە ناو ئابووری وڵات، ئەم کردارە بۆ پارە کەمو بچوکەکان بە خێرایی ئەنجام دەدرێتەوە، بەڵام سەبارەت بەو کارو پرۆژانە کە پارەیەکی زۆری تێدایە کاتێکی زیاتری دەوێت کەواتە ئەو کەسانە کە ئەو کارانە ئەنجام دەدەن دەبێ بە سەبرو خۆراگربن·

نەتەوە یەکگرتووەکان ساڵانە قەبارەی کردارەکانی شۆردنەوەی دراو بە نزیکەی 500 ملیار دۆلار لە قەڵەم دەدەنو سەرچاوەی ئەو دراو و پارە نایاساییانە لە فرۆشتنی ماددە هۆشبەرەکان، کاری سێکسی، مامەڵەکانی ئابووری نایاسایی، وەرگرتنی بەرتیلو گەندەڵییە کارگێڕیو دەوڵەتییەکانو خۆدزینەوە لە پێدانی باج پۆلێن دەکات·

س/ ئینتەرنێت·

ن/تام واتسون
و/ دڵشاد فایەق

# چەند ڕێگایەکی کورت بۆ چارەسەری کێشە داراییەکان

ئایا دەزانیت کە لە (٧٠٪)ی نیگەرانی ئێمە پەیوەندی بە مادییاتەوە هەیە؟ بەڕێوەبەری ناوەندێکی ئامار دەڵێت: زۆربەی خەڵك لەو باوەڕەدان کە ئەگەر لە (١٠٪) بۆ دەرامەتیان زیاد ببێت ئیدی نیگەرانی داراییان نامێنێت، هەڵبەتە لە هەندێ ڕووەوە ئەم قسەیە ڕاستە، بەڵام هەندێجار ڕاست نییە بۆ نموونە ڕاوێژکاری دارایی کۆمپانیایەکی گەورەی بازرگانی دەڵێت: زیادبوونی دەرامەت نیگەرانییە داراییە سەرەکییەکانی ئێمە چارەسەر ناکات، زۆر جار بینراوە زیادبوونی دەرامەت جگە لە خەرجی زیاترو دەردەسەری زیاتر سودێکی دیکەی نەبووە، ئەوەی کە بۆتە هۆی نیگەرانی خەڵك نەبوونی پارە نییە، بەڵکو ئەوەیە کە نازانن چۆن پارەکەیان خەرج بکەن!

بە خوێندنەوەی ئەم ڕستانەی سەرەوە دەچمە سەر ئەوەی کە باسی ژیانی خۆمتان بۆ بکەم:

من لە ژیانمدا کێشەی زۆری داراییم هەبووە ڕۆژی (١٠) کاتژمێر لە کێلگەیەکدا کاری سەختو گرانم دەکرد، بەرامبەر بە کارەکەم کرێیەکی کەمم وەردەگرت، ڕۆژگارم سەخت بوو، ئارەزووم ئەوە بوو ڕۆژێك بێتە پێشەوە لەو کارە سەختە ڕزگارم ببێت. نزیکەی بیست ساڵی تەمەنم لە خانوویەکی بچوکی بێ گەرماوو ئاوی کەمدا بەسەر برد، باش دەزانم چەندین کیلۆمەتر بە پێ ڕۆیشتن بۆ پاشەکەوت کردنی تەنها سکەیەكو بوونی پێڵاوی دڕاو و پانتۆڵی پینەدار یانی چی! باش دەزانم خواردنی هەرزان قیمەت یانی چی!! ئەو ڕۆژانە لە ترسی بێ پارەیی هەرچۆنێك بوو کەمێك پاشەکەوتم دەکرد، لە ئەنجامدا تێگەیشتم کە بارودۆخی دارایم چاك بووە، وتم دەبێت کارگەیەك بۆ بازرگانی کردن بنیات بنێم، یانی ئەوەی کە بەرنامەیەکم هەبێت بۆ خەرج کردنی پارە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم کارە ئەنجام نادەن، بۆ نموونە من ژمێریاری کۆمپانیایەك دەناسم کە لە کارەکەیدا بێ وێنەیە، بەڵام هەر کە مووچەکەی وەرگرتو لە دەرگای کۆمپانیا هاتە دەرەوەو بەرەو ماڵ بەڕێکەوت، بە بێ ئەوەی لە بیری پێدانی کرێ خانوو، پارەی کارەباو پێداویستییەکانی تری ژیانیدا بێت، کە قەمسەڵەیەك دەبینێت لە ناو دوکانێکدا سەرنجی ڕادەکێشێتو بی یەكو دوو دەیکڕێت، لە حاڵێکدا دەزانێت ئەگەر ئەو کۆمپانیایەی ئەو کاری تێدا دەکات بیەوێت بەو شێوەیە خەرجی بکات زۆر زوو دووچاری شکست دەبێت.

بەڵام ئەزمونی من دەربارەی خەرج کردنی پارە:

یەکەم: پارەیەك کە دەتەوێت خەرجی بکەیت لەسەر کاغەز بینووسە:

سەردەمێك کە (ئەرنۆڵد بنت) پەنجا ساڵ بەر لە ئێستە نووسینی دەست پێکرد بێ ئەندازە هەژارو کەم دەرامەت بوو، هەر لەبەر ئەوە ئەو پارەیەی کە خەرجی دەکرد لەسەر کاغەز دەینووسی بەم کارەی تێگەیشت کە پارەکانی لە چیدا سەرف دەکرێن، ماوەیەك بەم کارەوە سەرقاڵ بوو، سەردەمانێك دوای ئەوە کاتێك سەروەتو ناوبانگێکی ئەفسانەیی بەدەست هێنا لەسەر ئەم کارەی هەر بەردەوام بوو. پسپۆڕانی کاروباری دارایی دەڵێن: ئەگەر ئێمە بە لایەنی کەمەوە یەك مانگ یان ئەگەر سێ مانگ حسابی وردی هەر پارەیەك بکەین کە خەرجی دەکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە پارەکەمان لە چیدا سەرف کراوە، ئەو کات دەتوانین داهاتی ژیانمان ڕێك بخەین. گرنگە بزانین کە زۆربەی خەڵکی کاتێکی زۆری خۆیان تەرخان دەکەن بۆ ژماردنی خەرجییەکانیان، بەڵام کە بۆیان دەردەکەوێت بە سەرسوڕمانەوە لە خۆیان دەپرسن، یانی من پارەکانم بۆ کڕینی ئەم جۆرە شتانە سەرف کردووە؟

دووەم: داهاتی خۆتان ڕێکبخەن لەگەڵ پێداویستییەکانتاندا:

دەکرێت دراوسێکەتان لە ڕووی ژمارەی ئەندامانی خێزانو دەرامەتەوە لەگەڵ ئێوە نزیك بن، بەڵام خەرجییەکانیان لەگەڵ ئێوە جیاوازی هەیە، هاوسەنگی خەرجی لە نێوان مرۆڤەکاندا جیاوازی هەیە. مەبەست لە ڕێکخستنی داهات ئەوە نییە کە خۆتان لە خۆشیو جوانییەکانی ژیان بێبەش بکەن، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە داهاتو خەرجییەکانتان پێکەوە هەماهەنگ بکەن.

ئایا دەزانیت کەسانێك ژیانیان لەسەر بنچینە دەرامەتەکانیان ڕێك دەخەن زۆر بەختەوەرترن لەکەسانی دیکە؟

بەڵام بەم شێوەیە ئەم کارە ئەنجام دەدرێت:

١-لیستێکی خەرجییەکانتان ئامادە بکەن.

٢-زۆرترین سوود لەپارەکانتان وەربگرن، هەموو کۆمپانیا گەورەکان کۆمەڵێك کارمەندیان

هەیە کە تەنها کاریان ئەوەیە کە چاکترینو پرفرۆشترین شمەك بکرن، دەی بۆچی ئێوە لە ماڵەوە ئەم کارە ناکەن؟

٣-بە زیادبوونی داهاتتان زیادەڕەوی لە خەرج کردندا مەکەن، زۆرێك لە خەڵکی کاتێك کەمێك داهاتیان بەرز دەبێتەوە وادەزانن بە مەبەستەکەیان گەیشتوون، ئەوانە زۆر زوو خۆشبەختی خۆیان بەهەدەر دەدەن، بە خەرجی زۆر خۆیان دووچاری کێشە دەکەن.

٤-خۆتان بۆ تەنگانە ئامادە بکەن، ئێمە دەتوانین بە ئەندازەیەك لە پاشەکەوت خۆمان لە بەرامبەر رووداوەکاندا قەرزار بکەین، بیربکەنەوە لە خۆتان، چ رووداوێك ئەگەری ئەوەی هەیە خەرجییەکی زۆری بووێت، بۆ نموونە نەخۆشی، ئاگرکەوتنەوەو یان هەر رووداوێك کە دەکرێت لەگەڵ خۆیدا خەرجییەکی زۆر بهێنێت.

٥-سوود لە پێشهاتەکان وەربگرە: خانمی (سپیر) لە بارودۆخێکی دارایی خراپدا بوو، رۆژێك تێگەیشت کە کێکی مرەبایی کە دوکانی شیرینی فرۆشەکەی نزیك ماڵیان دەیفرۆشێت زۆر خۆش نییە، لە خاوەنی دوکانەکەی پرسی کە ئایا ئامادەیە کێکی مرەبایی ئەو کە لە ماڵەوە دروستی دەکات بیکرێت؟ کاتێك خاوەنی دوکانەکە ئامادەیی دەربڕی، کێکەکەی دروستکردو هێنای بۆ دوکانەکە، خاوەن دوکانیش زۆری بە دڵ بوو و داوای لێکرد هەندێکی تری بۆ بهێنێت، زۆری پێنەچوو داواکاری لەسەر ئەو کێکە زۆر زیادی کرد، ماوەیەك دوای ئەوە خەڵکی لە پشت دەرگای دوکانەکە ریزیان دەبەست بۆ کڕینی، تەنانەت ئەو خانمە ناچار بوو چەند کرێکارێك بگرێت بۆ ئەوەی شیرینییەکەی ئامادە بکات. سەیری دەوروبەرتان بکەن خواستی زۆر هەیە کە دەکرێت جێبەجێ بکرێت، بۆ نموونە ئەگەر ئێوە چێشت لێنەرێکی باشن هەر لە چێشتخانەکەی خۆتاندا دەتوانن خولێك بۆ کۆمەڵێك لە داخواز بکەنەوە، دڵنیام ئەم پێشهاتە بۆ هەموو کەس روودەدات.

٦-دەربارەی کاروبارى دارایی جۆرێکی تر بیربکەنەوە، بۆچی بەردەوام خەم دەخۆن کە بۆچی ژیانمان وەکو فلانە کەس نییە؟

ئەگەر ناتوانین بە تەواوەتی ئەو شتانەی کە دەمانەوێت بەدەستی بهێنین دەی بۆچی ژیان لەخۆمان تێك بدەین. واباشە کەمێك لەگەڵ خۆمان دڵسۆز بینو ژیرانە بیر بکەینەوە.

یەکێك لە فەیلەسوفەکانی رۆم دەڵێت: ئەگەر رازی نیت بەوەی کە هەتە، ئەگەر هەموو دونیاش تۆ خاوەنی بیت دیسانەوە هەر رازی نیتو بەختەوەر نابیت. هەمیشە لە یادتان بێت ئەگەر هەموو دونیاتان پێبدەنو لەدەوری هێڵێکی رێك بکێشن دیسان زیاتر لە ٣جار نان ناخۆیت، لە ماوەیەکی دیاریکراو زیاتر ناتوانیت بخەویت!

س/ گۆڤاری خانەو خانوادە ژمارە ٣٩٠

# کڕیارەکەت بناسە








بەرپرسێکی فرۆشەمەنی کۆمپانیای «کۆکا کۆلا»ی جیهانی، لەو ئەرکەی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پێی سپێردرابوو، بە بێ هیوایی گەڕایەوە. هاوڕێیەکی لێی پرسی: (بۆچی بەرنامەی بازاڕسازییەکەت، لە وڵاتە عەرەبییەکاندا شکستی هێنا؟) ئەویش لە وەڵامدا وتی: (کاتێك بوومە بەرپرسی فرۆشەمەنی بەرهەمەکانی کۆمپانیای «کۆکا کۆلا» لە وڵاتە عەرەبییەکاندا، متمانەم بە خۆم هەبوو کە بەرزترین ئاست لە فرۆشەمەنیدا دەهێنمە دی. بەڵام گرفتی زمان بەرەنگارم بوویەوە، عەرەبیم نەدەزانیو پێی نەدوابووم. بۆیە لە شوێنە گشتییەکاندا، پشتم بە هەڵواسینی وێنە بەست. ئەوەش بەگوێرەی بەرنامەی بازاڕسازییەکەم، بۆ گەیاندنی پەیامەکە بە بەکارهێنەر). پاشان بەرپرسەکە دەستی بە باسی وێنەکان کردو وتی:

(لە وێنەی یەکەمدا: کابرایەك لەسەر لمی گەرمو وشكو سوتێنەری بیاباندا، راکشاوە. ماندوو و مردوو، لە بێ هێزیدا لە پەلوپۆ کەوتووە.

لە وێنەی دووەمدا: کابرا «کۆکا کۆلا» دەخواتەوە.

لە وێنەی سێیەمدا: کابرا لەو پەڕی چوستو چالاکیو گەرمو گوڕیدایەو بەبیاباندا رادەکات).

لێرەدا هاوڕێیەکەی هەڵی دایەو وتی: (باشە ئەم وێنانە بۆ سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا؟!)

بەرپرسی فرۆشەمەنییەکە وتی: چونکە من هەر گیز ئاگاو هەواڵم لەوە نەبوو، ئەوان لە راستەوە بۆ چەپ، سەیری وێنەکان دەکەن)! ئێمەش دەڵێین: وێنەکان خوێندنەوەیان لە راستەوە ئەنجامەکەی راستە!

سەرچاوە: العلاقات ژمارە:٢٨

# کچان و کوڕان لە نێوان ئازار و ئاواتدا




کات یەکێکە لە گەورەترین خەڵاتەکانی پەروەردگار بۆ مرۆڤ، کە تیایدا دەتوانێت ئاواتو ئامانجەکان بهێنیتە دیو کارو چالاکییەکانی خۆی تێدا ئەنجام بدات.

سەرکەوتووترین مرۆڤیش ئەو کەسەیە کە توانیویەتی بە باشترین شێوە سوود لە کاتەکانی وەربگرێت، هاوکات کەساسترینو داماوترین مرۆڤیش ئەو کەسەیە کاتەکانی بە هەدەر دەباتو هیچ سوودێکیان لێ وەرناگرێت.

دەبێت ئێمە ئەوە بزانین کە گەورەترین سەرمایەی ئێمە کاتەکانمانەو هەموو سەرمایەکانی دیش بەرهەمی ئەو کارانەن کە بە هۆی ئەو سەرمایەیەوە دەستمان کەوتوون، دەوڵەمەندی، زیرەکیو دانایی، لەشساغیو کامەرانی،... هتد. بەرهەمی سوود وەرگرتنە لە کاتەکانمان.

کەواتە ئێمە بە کۆنترۆڵکردنی کاتەکانمان دەتوانین بە هەموو ئاواتو خۆزگەکانمان بگەین.

خۆشەویستانم، گرنگترین قۆناغەکانی تەمەنیش تەمەنی لاویو گوڕی گەنجێتییە کە تیایدا مرۆڤ لە گوڕو تینو وزەیەکی بێ سنوور دایەو هێشتا سەرقاڵی ژیان رووی تێنەکردووە.

لەم تەمەنەدا دەتوانین توێشوویەکی بە پێز بۆ ئێستاو ئایندەمان پێکەوە بنێینو ببینە خاوەنی پلانو بەرنامەو ئامانجی خۆمان.

دەبا ئەگەر تا ئێستا ژیانمان بە شپرزەییو بێ بەرنامەیی بەسەر بردووەو کاتەکانمان بە هەدەر داوە، چیتر بەو شێوەیە بەردەوام نەبینو گرنگترین بڕیاری ژیانمان بدەین، بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن سوود لە هەموو چرکەیەکی ژیان وەربگرینو دروشمی کات ژیانە هەمیشە لەبەر دیدی دووربینمان بێت، تەمەن بکەینە کێڵگەیەکی سەوز بۆ هیواو ئاواتو ئامانجو داهێنانە بە سوودەکانمان. هەموو دەستکەوتو داهێنانەکانی مرۆڤایەتی بەرهەمی سوود وەرگرتنە لە کات.

دەبا پێکەوە بەرنامەیەك بۆ سوود وەرگرتن لە کات دیاری بکەینو تیایدا خۆمانو وزەو تواناکانمان بناسینو سوودیان لێ وەربگرین.

پێویستە رۆژانە ئەو کاتانە دیاری بکەین کە کارە هەنووکەییە رۆژانەییەکانی تێدا ئەنجام دەدەین، وەك کاتەکانی خەو، نانخواردن، خۆ ئامادەکردنو خۆگۆڕینو ..هتد. کاروباریماڵەوە بە تایبەت بۆ کچان هەروەها کاتی دەوام (قوتابخانە، زانکۆ، فەرمانگە... هتد)، پێویستە خۆمان لەسەر کاتێکی دیاریکراو بۆ نووستن رابهێنین، بۆ نموونە: لە کاتژمێر (١٠)ی شەو تا ٥:٣٠ی بەیانی کە دەکاتە حەوت کاتژمێر، بۆ چەسپاندنی هەر بەرنامەیەکیش پێویستە بە لای کەمەوە (١٥) رۆژ لەسەری بەردەوام بیت تا لە کاتژمێری بایۆلۆجیتدا جێگیر دەبێت.

دواتر پێویستە کاتە بە تاڵەکانت دیاری بکەیت بۆ نموونە: ئەگەر دەوامەکەت بەیانیان بێت، دوای کاتژمێر (٢)ی پاش نیوەڕۆ تا خۆر ئاوابوون، دوای نانخواردنی ئێوارە تا کاتی خەوتن.

رۆژەکانی پشوو، هەینی.. هتد.

پاشان ئەو چالاکیانەی کە ئارەزوویان دەکەین: خوێندنەوە، وەرزش، خۆشنووسی، نیگارکێشان، نووسین، سەیرکردنی بەرنامەی بە سوود لە کەناڵە جیهانییەکاندا.

یا خود ئەگەر رۆژانە تاقێك کاتی بە تاڵت هەبوو، بوارێکی پیشەیی تێدا ئەنجام بدەیت، بۆ نموونە دوای دەوام لە بوارەکانی کۆمپیوتەرو بەرنامەسازیو وەرگێڕانو هەر بوارێکی گونجاوی تردا کار بکەیت بە مەرجێك رێگە نەدەیت کاردانەوەی خراپی هەبێت لەسەر خوێندنەکەت.

دەتوانیت بەم کارەت لە ئێستاوە سەرچاوەیەکی ماددی باش بۆ خۆت دیاری بکەیتو ئەرکی سەرشانی خێزانەکەشت سووك بکەیتو لە ئێستاشەوە بەرنامەیەك بۆ بژێوی داهاتووت دیاری دەکەیت، نەك وەکو زۆربەی زۆری خوێندکارانی زانکۆ هیچ بەرنامەیەکیان لە خەیاڵدا نییە تەنها ئەوە نەبێت کە دوای شانزە ساڵ خوێندن چاوەڕوانی ئەوەن حکومەت بە خێری خۆی لە شوێنێك بە فەرمانبەر دایانمەزرێنێت.

من بە باشی نازانم خشتەیەکی تایبەت دابنێم، چونکە زەحمەتە هەموو بتوانن بە یەك بەرنامەوە پەیوەست بن، لەبەرئەوەی کاتەکانتان جیاوازە، بەڵام دەبێت بەرنامەکانی رۆژانەمان هەموو ئەو بوارانە بگرێتەوە، ئیتر خۆتان دەتوانن لە کاتەکانتاندا جێگای بۆ بکەنەوە:

١- لایەنی رۆحیو دەروونی: باشترین کاتژمێری تەوقیت کراو کە گورجو گۆڵیت پێ دەبەخشێت نوێژەکانە بە تایبەت نوێژی بەیانی، هەوڵ بدە هەمیشە ئەو کاتانەی خۆر هەڵدێت بەخەبەر بیتو هاوڕێی خۆر بیت نەك پێخەف. لەم لایەنەشدا دەبێت پرۆژەی خێرخوازیو بەخشینو مرۆڤ دۆستانەت لە یاد نەچێت.

٢- لایەنی تەندروستی: گرنگیدان بە وەرزشو لەشو لار جوانیو خواردنو خواردنەوەی بەسوود.

٣- پەرەپێدانی خود (خود کارگێڕی)، متمانەت بە خۆت هەبێتو پەرە بە تواناکانت بدەو لە وزەو تواناکانت سوود وەربگرەو خۆت بناسەو هاوڕێیەکی باشی خۆت بە.

٤- بواری خێزانی: کات دیاری بکە بۆ پەیوەندیو ئەرکە خێزانییەکانت بەرامبەر دایكو باوكو خوشكو براکانت.

٥- بواری کۆمەڵایەتیو پەیوەندییە مرۆییەکان: زۆر گرنگە لە ژیاندا پەیوەندی بەسوود دروست بکەیتو هاوڕێی باشمان هەبێت بۆ درێژە پێدان بە ژیانو گەیشتن بە سەرکەوتن.

٦- ئاشنا بوون بە هونەرەکانی ژیان: نووسینو خوێندنەوەو ئاخاوتن، گوێگرتن، بیرکردنەوە..هتد.

٧- فێربوونی زمانو ئاشنا بوون بە زانستو ماریفەتی جیهان، خۆ ئەگەر رۆژانە (١٠) وشە لە بەربکەین لە زمانێکدا مانگانە دەگاتە (٣٠٠) وشەو ساڵانە (٣٦٠٠) وشە، کە بە هۆیەوە دەتوانیت بەو زمانە بخوێنیتەوەو قسەش بکەیت!!

خۆ ئەگەر (٢) ساڵ تەرخان بکەین هەر رۆژەی یەك کاتژمێر، ئەوا لەو زمانەدا دەبینە پسپۆڕ.

٨- با تەماشاکردنی تەلەفزیۆنت ئامانجدار بێتو ئەو بەرنامەو فیلمە بەسوودانە هەڵبژێرە کە دەتەوێت تەماشایان بکەیتو رۆشنبیریو زانیاری بەسوودت پێ دەبەخشن.

دواتر هەموو بەرنامەکانت لە خشتەیەکی گونجاودا بنووسەرەوەو کاتەکانی دیاری بکە بۆ نموونە:

کاتژمێر ٧:٠٠ی شەو تا ٨:٣٠ سەعیکردنی وانەی (.........)

٨:٣٠ تا ٩:٠٠ ی شەو تەماشاکردنی بەرنامەی (.........) لە کەناڵی (.........)

٩:٠٠ تا ١٠:٠٠ ی شەو خوێندنەوەی کتێبی (......)

بەیانیان زوو کاتژمێر (٦ تا ٧)ی بەیانی لە بەرکردنی دەقەکان: وەك قورئانی پیرۆز، شیعرو هەڵبەست، وشەی زمانێك کە دەتەوێت فێری ببیت...هتد.

لەگەڵ هیوای سەرکەوتندا.




کاتەکان سەرمایەی مرۆڤەکانن، هێواش هێواش تێدەپەڕن ناشتوانرێت کۆبکرێنەوەو لەکاتی پێویست بەکاربهێنرێن، ناشتوانرێت قەزا بکرێنەوە، کەواتە پێویست دەکات نەخشەی وردیان بۆ دابڕێژرێت، بۆ ئەوەی هیچ کاتێکمان بەخۆڕای لێ نەڕوات، فەرموو ئەم خاڵانەی خوارەوە بخوێنەرەوەو بڕیاری دروستی خۆت بدە:

١- نەقۆستنەوەی کاتەکانو بە فیڕۆدانی لەشتی بێ سوودا.

٢- جیاوازی نەکردن لەنێوان کاری زۆر گرنگو کەم گرنگ.

٣- خراپ بەکارهێنانی کات بۆڕاپەڕاندنی کار بەپێشخستنی لەکاتی گونجاودا یان بەدواخستنی.

٤- تەواونەکردنی کار.

٥- دووبارەکردنەوەی کارێك زیاتر لەجارێك.

٦- جێبەجێکردنی کار بەشێوەیەکی سەرپێی و نەبوونی پلانێکی باش بۆکار.

**ڕێکخستن:**

ڕێکخستن بەکارهێنانی هۆکارە گونجاوەکانە بە مەبەستی بەدی هێنانی ئامانج لەڕێگەی پلانی دامەزراوەوە.

* چۆن ڕۆژێکی ژیانت ڕێکدەخەیت؟

١- لیستێك ئامادەبکە بۆکارەکانی ئەو ڕۆژەت لە ئێوارەی ڕۆژی پێشتر.

٢- کارەکان دابەش بکە بەشێوەیەکی جوگرافیایانە.

٣- بالیستەکەت ئاسان بێت بۆ جێبەجێ کردن.

٤- کاتێك دابنێ لەبەرنامەکەت بۆ پێشهاتە کتوپڕەکان.

٥- دەست پێشخەری بکە لەقۆستنەوەی کاتی پشتگوێ خراو لەکارە دورو درێژەکاندا.

٦- بۆئەوەی تووشی بێ تاقەتیو نائومێدی نەبیت کارەکانت جۆراو جۆربکە.

٧- خۆزگە خشتەیەکی گونجاوت ئامادە بکردایە بۆ بەرنامەی کارەکەت.

٨- هەندێك لەبەرنامەی ڕۆژانەت دابنێ بۆ پرۆژە گەورەکانت.

**خۆبەڕێوەبردن:**

١- مافەکانی خوای گەورە لەسەرت بەچاکی بەجێ بهێنەو پەنای پێبگرە.

٢- هەمیشە گەشبین بەو بە پشتیوانی خوای گەورە بۆ ئاسۆکانی سەرکەوتن بڕوانە.

٣- لە ساتی بەجێهێنانی هەموو کاروبارێك واخۆت ڕابهێنە کەپێویستە ئامانجەکانت ڕوونو پڕشنگدار بێت.

٤- دوربکەوەرەوە لەئاڵۆزی خاووخلیچکی لە بەجێهێنانی کارەکانداو هەوڵ بدە بۆ هەموو کارەجیاوازەکانی ژیانت پلانت هەبێت.

٥- لەهەوڵدانت بەرەو ئامانجەکانت بەرۆشنیو زیندوویی پلانەکانت ڕێکبخە.

٦- ئاگاداربە لە بە فیڕۆدانی بەشێك لەکاتەکانت بە بێکار، چونکە بەفیڕۆدانی ژیانە.

٧- کارەکانت ڕێکبخە بەنووسینی کارەپێش وەختەکانت، کە پەیوەستی پێوەیو خۆت ڕابهێنە لەسەر لەبەرکردنیان.

٨- بەرگری بکە لەهەموو هەوڵێکی دەروونت بۆ دورخستنەوەت لە هەر کارێکی گرنگو بەکەڵك، بۆ ئەوەی ڕاتنەکێشێت بەرەو ئارەزوو کاریو بێسەرو بەری.

٩- لەبیرت نەچێت کەکارەکان لەکاتەکان زیاترن.

١٠- ئاگاداری ئەو خەونانە بە کە بە ئاسمانی خەیاڵتەوە هەڵواسراون، هەروەك دەبێ دوورکەویتەوە لەو ڕەشبینیانەی کە ڕێت لێدەگرێت، ڕەشبینی لەناو بەری هیواکانە.

١١- خۆت نوقم مەکە لەناو کەمالیات، چونکە تیادەچیت، بەڵکو بەرەو ئامانج و پاشەڕۆژت چەندە توێشووت پێویستە هەڵی بگرە.

١٢- هەمیشە واقیع بین بە، دوور بکەوە لە زیادە ڕەویو کورت بینی.

١٣- لەکۆتاییدا:: بزانە لە هەموو مرۆڤێکدا نیشانەی بەهێزو لاواز هەیە، تۆ خۆت لە هەمووکەس زیاتر بە دەروونی خۆت ئاشنایت ئەگەر خۆت بە هەڵەدا نەبەیت.

چۆن لایەنە خراپەکانی ژیانت کەم دەکەیتەوە؟

١- ڕێژەیەکی پێویست بخەوەو زیادە ڕۆیی تێدا مەکە.

٢- بەیانیان زوو لەخەو هەستەو لەناو جێگەکەتدا زۆر ئەم دیوو ئەو دیو مەکە.

٣- نوێژی بەیانیانت لەکاتی خۆیو بە کۆمەڵ لەدەست مەدە.

٤- ویردو نزاکانی بەیانیانت لەیاد نەچێت، چونکە کلیلی خۆشبەختی ئەو ڕۆژەتە.

٥- بە هێواشیو لەسەرخۆیی پلانی ئەو ڕۆژەت جێبەجێ بکە.

٦- سووربە لەسەر جۆراوجۆرکردنی بەرنامەکانت، باشتانێکی تێدابێت کە لەلات خۆشەویستن.

٧- هەرکات لەماڵ چوویتەدەر بەرەو کارەکەت ئەوا دوعای دەرچوون لەماڵ بخوێنەو ئەگەر سواری ماشێنیش بوویت ئەوا دوعاکەی بخوێنە.

٨- هەرکەس لەهاوڕێیانو دۆستانت بینی، تۆ دەست پێشخەری بکە لەزەردەخەنەو سڵاو کردن.

٩- هەوڵ بدە بەرنامەی کارەکانت یەك بە یەك جێبەجێ بکەیت، لەگەڵ تەواوبونی ئەو ڕۆژەداو با هیچ نەمێنێتەوە بۆ ڕۆژی دوایی.

١٠- کاتی گەڕانەوەت بۆماڵ باڕووت خۆشو گەش بێت.

١١- ئەگەر کاتێکی کەمیش بێت لەبەرنامەکەت دابنێ بۆحەوانەوە.

١٢- بەشداری دراوسێو هاوەڵانو خزمان بکە لە بۆنەکانیاندا.

# چۆن دوژمنەکەت دەکەیتە دۆست؟!

و/بەرزان ئەبوبکر



-لە ساڵی (٢٢٥ پ.ز) پاشا چاکو لیانگ سەرکردەیەکی لێهاتوو فەرمانڕەوای شاری (شو) لە وڵاتی چینی کۆن بوو، لەو ساڵەدا دووچاری بارودۆخێکی ترسناک بوویەوە، ئەویش هێرش کردنە سەر شارەکەی بوو لە لایەن پادشای ویلایەتی (وی) کە بە نیازی هێرشێکی بەهێز بوو، لە باکوری شارەوە، جگە لەوەش پەیماننامەیەکی بەهێزیان بەستبوو لەگەڵ هەمەجییەکانی بەشی باشوری شاری شو، کە بڕیار وابوو ئەوانیش بە سەرکردایەتی شا (مینگۆ) هێرش بکەنە سەر شاری شو. لەم کاتەدا سەرکردە (لیانگ) بیری لەوە کردەوە سەرەتا ڕووبەڕووی خەتەری دووەم ببێتەوە، واتە ڕووبەڕووی مینگۆ بێتەوە لە بەشی باشورەوە.

(لیانگ) سوپاکەی ئامادەکرد بۆ ڕووبەڕوو بووونەوەی بەشی باشور، پیاوێکی ژیرو دانا لە نێو سوپاکەی (لیانگ)دا ئامۆژگارییەکی پێشکەش کردو وتی: (ڕەنگە زۆر ئاستەم بێت، بتوانیت بە زەبری هێز ئارامی بۆ شارەکەت دەستەبەر بکەیت، چونکە ئەگەر لە بەشی باشور سەرکەوتن بە دەست بهێنیت، ئەوا سوپاکەی مینگو دەتوانن بچنە پاڵ شانشینی (وی)و لەگەڵ ئەواندا جارێکی تر هێرش دەکەنەوە سەر شارەکەمان، لەبەرئەوە: بە دەستهێنانو ڕاکێشانی دڵەکان، چاکترە لە بە دەست هێنانی شارەکان، تێکهەڵچوون لەگەڵ دڵەکان چاکترە لە تێکهەڵچوون بە چەکو تەقەمەنی، هیوادارم بتوانیت دڵی ئەو سەربازانەی لەگەڵ مینگۆدان بۆ لای خۆت ڕابکێشیت)! (لیانگ)بە سوپاسەوە وەڵامی دایەوە: (تۆ بیرۆکەی منت خوێندۆتەوە).

هەروەکو (لیانگ) چاوەڕێی دەکرد مینگۆ لە کاتو ساتی دیاری کراودا هێرشێکی زۆر بەهێزی کردە سەر شو، بەڵام (لیانگ)ی سەرکردە بە پێی دانانی پلانێکی سەربازی تۆکمەو بەهێز، تەڵەیەکی بۆ سوپاکەی مینگۆ دانا، مینگۆو سوپاکەی کەوتنە نێو تەڵەکەوەو بواری هەڵاتنو دەربازبوون لە بەردەمیاندا ئاستەم بوو، بۆیە بە ناچاری خۆیاندا بە دەستەوەو تەنانەت مینگۆ خودی خۆی بوویە یەکێك لە دیلەکانی ئەو شەڕەو دەست بەسەر کرا، (لیانگ) لەگەڵ ئەوەدا کە سەرکردەیەکی زۆر ئازاو خاوەن پلانی سەربازی بوو، لە

هەمان کاتدا کەسێکی ژیرو سیاسی بوو، بۆیە لە بری سزادانو لە سێدارەدانی دیلەکان، لە هەنگاوێکی چاوەڕوان نەکراودا، دیلەکانی لە سەرکردەکەیان کە مینگۆ بوو جیا کردەوەو چوو بۆ لایانو فەرمانی کرد کۆتو زنجیرەکان لە دەستو قاچیان بکەنەوەو خواردنو خواردنەوەیان بۆ ئامادە بکەنو پاشان وتی: لە راستیدا دەزانم کە ئێوە پیاوانێکی رێزدارو خاوەن بنەماڵەو خانەدانن، من لەو بڕوایەدام کە ئێستا دایكو باوکتانو هاوسەرەکانتانو منداڵەکانتان چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئێوە دەکەن، بێگومان ئەوان ئێستا هۆن هۆن فرمێسکتان بۆ دەڕێژنو خەمباری بۆتە میوانی دڵەکانیان، لەبەرئەوە بڕیارمدا بەرێزتان ئازاد بکرێنو بگەڕێنەوە بۆ لای دۆستانو ئازیزانتان، بەندکراوەکان بە چاوی فرمێسکاویو بە قوڕگی پڕ لە گریانەوە، زۆر سوپاسی (لیانگ)ی سەرکردەیان کرد، پاشان (لیانگ) ناردی بە شوێن مینگۆی سەرکردەدا، پێی وت: (ئەگەر ئێستا ئازادت بکەم، چی دەکەیت؟) مینگۆ زۆر بوێرانە وەڵامی دایەوەو وتی: (جارێکی تر سوپاکەم رێك دەخەمەوەو هێرشێکی توندتر دەکەمە سەر شارەکەت، بەڵام ئەگەر بۆ جاری دووەم توانیت دەستبەسەرم بکەیت، ئەو کات دان دەنێم بە سەرکەوتنەکەتدا)، (لیانگ) سەرەڕای ئەوەی بڕیاری ئازادکردنی دا، فەرمانی کرد ئەسپێکی باشی بەزینەوە بە دیاری پێ بدەن!

بەم بڕیارەی لیانگ سەربازەکانی نیگەران بوون، بۆیە پرسیاریان لێکرد سەبارەت بەو هەڵسوکەوتە نامۆیە، لە وەڵامدا وتی: دەستبەسەرکردنەوەی مینگۆ کارێکی زۆر ئاسانە، چۆن دەتوانم دەست بکەم بە گیرفانمداو شتێکی لێ دەربهێنم، هەروەها دەتوانم بۆ جاری دووەم مینگۆ دەست بەسەر بکەمەوە، ئەوەی من مەبەستمە ئەوەیە کە دڵی بە دەست بهێنم، ئەگەر توانیم ببمە خاوەنی دڵی، ئەو کات ئارامیو ئاسایشی شارەکەم لە بەشی باشور دەستەبەر دەکەم.

مینگۆ هەر وەکو ئەوەی کە وتی: جارێکی تر هێرش دەکەمەوە سەر شاری شو، خۆی ئامادە کردەوە بۆ هێرش کردن، بەڵام ئەمجارەیان ئەو ئەفسەرانەی کە لە شەڕی یەکەمدا لە لایەن (لیانگ)ەوە ئازاد کرابوونو بەشێوەیەکی زۆر مرۆڤ دۆستانە مامەڵەیان لەگەڵدا کرابوو، لە مینگۆ هەڵگەڕانەوەو رازی نەبوون دژی (لیانگ) شەڕ بکەنەوە، بۆیە هەر خۆیان مینگۆیان دەستبەسەر کردوو تەسلیمی (لیانگ)یان کرد.

(لیانگ) هەمان پرسیاری پێشووی ئاراستە کردەوە: (ئەگەر ئێستا ئازادت بکەم، چی دەکەیت؟!)

مینگۆ وتی: شکستی ئەمجارە بە رێگەیەکی سەربازی نەبوو، بەڵکو ئەفسەرەکانم ناپاکییان لەگەڵ کردم، بۆیە ئەگەر ئەمجارەش ئازادم کەیت، بە هەمان شێوە لە دژی تۆ دەجەنگم، بەڵام ئەگەر بۆ جاری سێیەم دەستبەسەرت کردم، ملکەچ دەبم بەرامبەر بە سەرکەوتنەکەت.

لە ماوەی چەند مانگێکدا (لیانگ) توانی بۆ جاری سێیەمو چوارەمو پێنجەم مینگۆ بە دیل بگرێت، لە هەر جارێکدا سوپاکەی مینگۆ زیاتر رقیان لێ دەبۆوە، چونکە هەموو جارێك (لیانگ) بەبێ ئەوەی ئازاریان بدات ئازادی دەکردن، هەموو جارێکیش داوای لە مینگۆ دەکرد کە دان بەشکستی خۆیدا بنێو ببێتە کەسێکی دڵسۆزو بە ئەمەك بۆ وڵاتەکەی، بەڵام مینگۆ بە بیانووی لاوازو بێ بنەما ئەو داوایەی رەت دەکردەوەو دەیوت: بەهۆی خراپی بەختمەوە سوپاکەم تێ دەشکێت، ئەگەر جارێکی تر بە دیل گیرام ئەوا بەڵێن دەدەم خۆم بە دەستەوە بدەمو سوێند دەخۆم هەرگیز ناپاکیت بەرامبەر ناکەم.

کاتێك بۆ جاری شەشەم مینگۆ بە دیل گیرایەوە، هەمان پرسیاری پێشووی ئاراستەکرا، ئەویش لە وەڵامدا وتی ئەگەر بۆ جاری حەوتەم بە دیل گیرام، بەڵێن دەدەم پشتیوانی خۆمت پێ ببەخشم، هەرگیز لە دژی وڵاتەکەت شەڕناکەمەوەو ناپاکیت بەرامبەر ناکەم، (لیانگ) ئەمجارەشیان وتی: زۆر باشە، بەڵام دڵنیابە ئەوە کۆتا مۆڵەتەو ئەمجارەیان هەرگیز ئازادت ناکەمو لێت نابوورم.

کاتێك بۆ جاری شەشەم مینگۆ ئازاد کرا، بەرەو شوێنێکی دووری شارەکە رۆیشت بۆ ناوچەیەك کە پێی دەوترا (وچ) دوای تێکشکانە یەك لە دوای یەکەکانی، تاکە هیوا کە لە بەردەمیدا مابوو ئەوەبوو کە داوای کۆمەك بکات لە (وتوگۆ)ی سەرکردەی (وچ). کە خاوەنی سوپایەکی زۆر بەهێزو لێهاتوو بوو، جەنگاوەرانی وتوگۆ زرێپۆشی پۆڵاینیان لەبەردابوو، کە رووپۆشکرابوو بە رۆنی زەیتو وشك کرابۆوە بۆئەوەی رەق ببێ تا بە هیچ شمشێرێك کون نەبێت.

مینگۆ بە هاوکاری ئەم سوپا زەبەلاحە بە رێکەوتن بۆ جەنگ دژی (لیانگ)ی لێبوردە، (لیانگ) کە ئەم هەواڵەی پێگەیشت، بە پێی پلانێکی سەربازی زۆر تۆکمەو بەهێز، تەڵەیەکی بۆ نانەوە لە چواردەوری دۆڵێکی تەسك سوپاکەی خۆی قایم کردو چاوەڕوانی هاتنی سوپای دوژمنی دەکرد، لە ناکاو ئەم سوپایە کەوتنە تەڵەکەی لیانگەوەو رێگەی دەربازبوونو هەڵاتنیان نەما، (لیانگ) فەرمانی کرد لە هەموو لایەکەوە دۆڵەکە ئاگر بدەن، کاتێك ئاگرەکە گەیشتە سوپاکەی دوژمن بە جارێك هەراسان بوون، تاکە رێگە لە بەردەم ئەم سوپایەدا بریتی بوو لە خۆ بەدەستەوەدان یا هەڵاتن کە زۆر زەحمەت بوو، بەم شێوەیە سوپاکەیان شکاو زۆریان خۆیان بە دەستەوەداو بە دیل گیران، (لیانگ) بۆ جاری حەوتەم توانی مینگۆو دارودەستەکەی بە دیل بگرێت، (لیانگ) کەسێکی نارد بۆ لای مینگۆو پێی گوت: (لیانگ منی راسپاردووە کە پێت بڵێم، کە جارێکی تر تۆ ئازاد دەکات، ئەگەر تۆش لە تواناتدا هەیە سوپاکەت بۆ جاری هەشتەم لە دژی وڵاتەکەمان رێکبخەرەوە، هەوڵ بدە ئەمجارەیان شکست بە (لیانگ) بهێنیت، بەڵام ئەمجارەیان بە جیاواز لە جارەکانی پێشوو مینگۆ کەوتە سەرزەویو دەستی کرد بە گریان، لەسەر ئەژنۆ بەرەو لای (لیانگ)رۆیشت، کەوت بەسەر دەستو قاچیداو هاواری کرد: ئەی پادشای میهرەبان، ئەی سەرکردەی لێبوردە، بەڵێنت پێ دەدەین ئێمە دەبینە پیاوانی باشوری شارەکەت، پەیمان بێت هەرگیز بەرهەڵستی دەسەڵاتت نەکەین، (لیانگ) وتی: ئێستا دانت نا بە سەرکەوتنەکانماندا؟ مینگۆ لە وەڵامدا وتی: خۆمو کوڕەکانمو نەوەکانی دوورۆژیشم، میهرو بەزەیی تۆ بەجۆرێك کاری کردۆتە سەر ناخو دەروونمان کە هیچ سنورێکی نییە، لە کاتێکدا شایستەی سێدارە بووین، تۆ بە لێبوردن وەڵامت داینەوە، ئیتر چۆن تەسلیم نابینو دان بە سەرکەوتنەکانتدا نانێین؟!).

(لیانگ)فەرمانی کرد خوانێك لەسەر شەرەفی مینگۆ ئامادە بکەن، جارێکی تر لەسەر کۆشکی پادشایی داینایەوەو تەواوی زەوییە داگیرکراوەکانیشی بۆ گێڕایەوە، لە دوای ئەوە مینگۆ بە خۆیو سوپاکەیەوە گەڕانەوە بۆ بەشی باشوری وڵاتەکەیو بوونە بەشێك لە پارێزەری وڵات!

بەم شێوەیە (لیانگ) توانی بەشی باشوری وڵاتەکەی لە شەڕوشۆڕو ئاژاوە رزگار بکاتو کەسانێك پەروەردە بکات کە پشتیوانیی بۆ نیشتمانەکەیان هەبێتو پارێزگاری لە وڵاتەکەیان بکەن.

(لیانگ) بە لێبوردن توانی دوژمنەکەی بکاتە دۆستی راستەقینەو دڵسۆزی وڵاتەکەی!

(لیانگ) بە لێبوردن توانی وڵاتەکەی بە درێژایی فەرمانڕەوایی خۆی لە شەڕو ئاژاوە رزگار بکاتو ئارامیو ئاسایشو هێمنی هەمیشەیی بۆ وڵاتو گەلەکەی دەستەبەر بکات!

(لیانگ) بە لێبوردن توانی جێگەی خۆی بکاتەوە لە نێو دڵی جەنگاوەرانی خۆیو جەنگاوەرانی دوژمنەکەشیدا!

سەرچاوە/کیف تمسك زمام القوة.

بەشی یەکەم

# سەرچاوەی مرۆیی و کۆمەڵگای زانیاری

ئا/ وەهاب حەسیب محەمەد

کاتێـک ئارمسـترۆنگ سـاڵی (١٩٦٧) لەسەرمانگ دابەزی جیهان بەسەرسوڕمانەوە تەماشای ئەو هەنگاوە ناوازەیان دەکرد، ئەوەی خەیاڵ بوو ئەمڕۆ بوو بەڕاست.

مرۆڤ لە کۆنەوە بە دەست کێشەی جۆراوجۆرەوە ناڵاندویەتی وەك: سروشتو هەڕەشەکانی، برسێتیو هۆکارەکانی،...هتد. هەردەم لەهەوڵ و تەقەلادا بووەو بە دوای چارەسەری گونجاودا کە بەدیهێنەری ئاسایشو ئارامی کێشە لە بن نەهاتووەکانی بێت، هەموو داهێنراوەکانی مرۆڤایەتی وەڵامی گومانو ترسەکانی مرۆڤن، ئەوەتا تفەنگ جێگای چەقۆو خەنجەر، تەلەفۆن شوێنی کۆتری نامەبەر، ئۆتۆمبیلو شەمەنەفەر جێگای وڵاخی باربەر... هتد، گرتۆتەوە..

بە دیوێکی تردا هەر رۆژگارەو کێشەی تایبەت بە خۆی هەیە. لێرەوە کۆمەڵگای مرۆیی لەدنیای ئەمڕۆدا رووبەڕووی کێشەی نوێ بۆتەوە، وەك گۆڕانی کەشوهەواو پیس بوونی ژینگە. سەرباری کێشە رامیاریو کۆمەڵایەتییەکان ئەنجامەکانی بریتین لە: جەنگ، زیادبوونی دیاردەی توندڕەوی، بڵاوبوونەوەی گەندەڵی، دەستاو دەستنەکردنی دەسەڵات بەشێوەیەکی دیموکراتی... هتد، هەموو ئەمانەش بە شێوەیەکی نەرێی لەسەر ژیانی خەڵكو حکومەتەکانیان ڕەنگی داوەتەوە. بەشێوەك ئەو ناوچەی ئێمەی تێدا دەژین (٧٠) ملیۆن نەخوێندەوار بوونی هەیە کە (٤٥) ملێونیان ئافرەتو منداڵن. ئەم کێشانە وایان کردووە لە دنیای ئەمڕۆدا دەوڵەتان توخوبی خۆیان تۆکمە بکەن لە پێناو زاڵبوون بەسەر کێشەکانداو هاوکات کاڵکردنەوەی ترسو گومانەکان لای هاونیشتمانیان، دابینکردنی ژیانێکی شایستەو گونجاو بۆیان دوور لە هەر ترسو هەڕەشەیەکی دەرەکی ئەمەش لەرێگەی گەشەپێدانی مرۆییو دابینکردنی ئاسایشی نەتەوەیی دێتە دی. کەواتە ئاسایشی نەتەوەیی بریتییە لە: کۆمەڵێك رەگەز، هۆکار، ئامراز، کە لەپێکهێنانی دەوڵەت و دروستکردنی هێزی ڕامیاری، ئابوری، سستەمی کۆمەڵایەتی، رێکخستنی ژینگەدا... هتد، دەوری کاریگەر دەبینێت. ئەمەش بۆ گەشەپێدانی مرۆییو دروستکردنی کۆمەڵگای مەعریفی ئەستەمە بەدیهێنانی.

گەشەپێدانی مرۆیی بریتیە: لە کۆمەڵێك ئامراز، هۆکار وا لەتاك دەکات کەسێکی بەرهەمهێن بێت، بتوانێت لەسەر پێی خۆی بوەستێت. لەبوارەکانی کارکردندا، دابینکردنی شوێنی حەوانەوە، خواردن... تاد. هاوکات لە بەدەستهێنانی بەشێکی زۆرتری خۆشگوزەرانیدا متمانە بەخۆی دەکات، بەشداربێت لە دروستکردنی کۆمەڵگاو بەرەوپێش بردنی، بەشداری کرداریی هەبێت لە دەوڵەتو بەهێزکردنی پایەکانی لەبوارەکانی: ئابوری، ڕامیاری، کۆمەڵایەتی، ئاسایشی نەتەوەیی. لە هەوڵو

کاری بەردەوامدا بێت لەگەڵ ئەندامانی تری کۆمەڵگا بۆ بەدەستهێنانی خەونو خۆزگەکانی لەچوارچێوەی کێبەرکێ دیموکراتیو یەکساندا.

١- سەرەتا ئەو بەربەستانەی پێش بە گەشەپێدانی مرۆییو گەشەی ئابوری دەگرن دەستنیشان دەکەین. پاشان دوو وڵات (ئیسرائیل- مالیزیا)، وەك دوو نموونە پیشان دەدەین یەکەمیان بەو ئەندازەیەی وڵاتێکە تازە دروستبووە بەپێوانەی زۆرێك لە وڵاتانی دنیاو ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لەو ماوە کەمەدا توانیویەتی ئابورییەکی بەهێز بنیات بنێ، ئاسایشی نەتەوەی تۆکمە بکات، هەلی فێربوون لە هەموو ئاستو تەمەنێکدا دەستەبەر بکات سەرەڕای ئەوەی لە ناوەندێکدایە هەمووان بە چاوی دوژمنو داگیرکار لێی دەنوارن، بەپشت بەستن بە گەشەپێدانی مرۆییو دروستکردنی کۆمەلگای زانیاریی، سەرەڕای هەژاری سەرچاوە سروشتییەکان، بە تایبەت نەوت.

٢- مالیزیاش نمونەیەکی زیندووە لەدوو ڕووەوە دەکرێت سودی لێوەربگیرێت:

أ- وڵاتێکە تا دەیەی شەشەمی سەدەی ڕابردوو نموونەی وڵاتێکی کشتوکاڵی بووە، نەخوێندەواریو هەژاری سیمایەکی دیاری ئەو وڵاتە بوون.

ب- دەکرێت وەك نموونەیەکی زیندوی وڵاتێکی ئیسلامی سودی لێ وەربگیرێت، (مالیزیا زیاد لە یەك ئایینو نەتەوەی تێدایە)، ئەمەش بناغەی پێشکەوتنو گەشەکردنە ئەگەر توانرا سودی لێ وەربگیرێت بە شێوەیەکی دروست.

مالیزیا:

مالیزیا وڵاتێکی ئیسلامییە خاوەن سەرچاوەی سروشتی دیاریکراوە پێکدێت لە: رۆن، دار، قەسدیر، کاوچوك، رووبەری وڵاتەکە (٣٢٩٧٥٠کم$^2$)، ژمارەی دانیشتوانەکەی (٢٧١٧٠٠٠) کەسە، تا شەستەکانی سەدەی رابردوو مالیزیا وڵاتێکی کشتوکاڵی بوو.

پاشان حکومەتی مالیزیا ستراتیژیەتێکی نیشتمانی دەست پێکرد بریتی بوو لە: کردنەوەی دەرگای وڵات بە رووی وەبەرهێنە بیانییەکاندا، پێشخستنی توانای هونەری دەستی کار بە مەبەستی بنیاتنانی ئابورییەکی پیشەسازی کە پشت ببەستێت بە زانیاریو پێشخستنی توانای هونەری هێزی کار، دواتر ئابوری ئەو وڵاتە لە ئابورییەکی کشتوکاڵییەوە گۆڕا بۆ ئابورییەکی پیشەسازی پێشکەوتوو کە پشت بەزانیاری دەبەستێت. بە هۆی ئەوگۆڕانکاریانەوە کە کۆڵەکانی بریتی بوو لە: توانای مرۆیی هاوکات پێشخستنی هۆکارەکانی پەروەردەو فێربوون، پاشان دامەزراندنی پەیمانگای لێکۆڵینەوە، دەزگای ڕاهێنانی پیشەیی، ئابوری مالیزیا پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی داهاتی نیشتمانی ساڵی ٢٠٠٧ گەیشتە ٨٤،٦ ملیار$ ئەم رێژەیە ٦٠،٤٪ زیاتر بوو لە چاو ساڵی ٢٠٠٦دا. رێژەی گەشەی ئابوری مالیزیا ساڵانە ٥،٨- ٦،٥٪ دایە، رێژەی بێکاریش ٣،٥٪ رێژەی هەناردەی پیشەسازی ئەو وڵاتە ٣٧٪ کۆی هەناردەی نیشتمانی پێك دێنێت.

سیستمی پەروەردەو فێربوون لە مالیزیا:

لە کۆتایی شەستەکانەوە تا ئەمڕۆ حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی ئەو وڵاتە ئەو پەڕی گرنکیان داوە بە فێربوون.

بە تایبەتی ڕاهێنانی پیشەیی کە هۆکارێکە بۆ دروستکردنی هێزی کاری بە تواناو لێزان. خوێندن لە قوتابخانەکانی ئەو وڵاتە بە زۆرەو بەڵام بە خۆڕاییە. سەرەڕای زمانی نیشتمانی دوو زمانی تریش دەخوێندرێت، گرنگییەکی زۆریش دراوە بە زمانی ئینگلیزی بەڕادەیەك یەکێکە لە مەرجەکانی تەواوکردنی خوێندنو دامەزراندن لە کاردا. گرنگی تەواویش دراوە بە ژێرخانی قوتابخانەکان وەك: دامەزراندنی تاقیگەی زانستی، کردنەوەی کتێبخانە لە قوتابخانەکاندا هەروەها پاڵپشتی کردنی زانستو بیرکاری، بەشداری لە دابینکردنی زانستو تەکنەلۆژیادا، بۆ هەموو چینو توێژەکانی گەل، وەزارەتی پەروەردەی مالیزیا پشت بە سیستمی خوێندنی ئینگلیزی دەبەستێت لەگەڵ چەند گۆڕانکارییەك کە لەگەڵ کۆمەلگای مالیزیدا بگونجێت.

سەرەڕای قوتابخانە دەوڵەتییەکان ٣٠خوێندنگەی جیهانی لە وەزارەتی پەروەردە ناویان هەیەو کارەکانیان جێگای باوەڕی دەوڵەتە، لقیان لە زۆربەی ناوچەو شارەکانی مالیزیادا هەیە وەك: کوالالامپور، بیراك، مالاکا... هتد. لەو وڵاتە بە رادەیەك گرنگی بە سەرچاوەی مرۆیی دەدرێت تا ئەو ئاستەی وەزارەتێك بە ناوی (وەزارەتی پلانو گەشەپێدانی سەرچاوە مرۆییەکان) دامەزراوە، بە یارمەتی ئەنجومەنی نیشتمانی ڕاهێنانو فێربوونی پیشەیی، ڕێسایەکی گشتگیری فێربوونو ڕاهێنانی پیشەیی بۆ هەموو پەیمانگاکانی ڕاهێنانو دەستگاکان دادەڕێژێت. ئێستا پەیمانگای فێربوونی پیشەییو پەیمانگای ڕاهێنان زیاتر لە ٧٠٠ جۆر بڕوانامە دەبەخشن بە خوێندکارەکانیان، دەوڵەتی مالیزیا توانی بینای ئابورییەکی بەهێزو چالاك بنیات بنێت کە پشت بە زانیاری دەبەستێت، ئێستا دووەم دەوڵەتە پاش وڵاتە یەکگرتووەکان لە نەخشەسازیو بەرهەمی پارچەی ئەلیکترۆنیدا، لەم بوارەدا لە پێش هەریەك لە چین، روسیا، هند، ئەمسا، وەیە، ٥٠٪ هاوڵاتیانی ئەو وڵاتە ئینتەرنێت بەکاردەهێنن ئەمەش بەرزترین رێژەیە لە جیهاندا. سەرەڕای چەندین گۆڕانکاری ئیجابی لە بواری خاوەندارێتیداو هاوکاری کردنی هاوڵاتیان لەو بوارەدا.

لێرەوە ئێمەش دەتوانین بەراوردێکی خۆمان، زانکۆکانمان، پرۆسەی خوێندنو ئاستی زانیاریو گەشەی زانیاری لە وڵاتدا بکەین هیچ نەبێت سودێك لە شارەزاییو ئەزمونیان وەربگرین بۆ دوا رۆژی نەتەوەکەمان.

سەرچاوە:١- التنمیە البشریە والمجتمع المعرفە. عبدالمحسن الحسینی. ٢- التعلیم العلمی والتکنلوجی فی اسرائیل د.صفاعبرالعالی.

## وانەیەك بۆ ژیان

**دەتوانیت هاوڕێیەتی گورگ بکەیت**

**بەومەرجەی هەمیشە تەورەکەت ئامادەبێت!!**



دڵدار حاجی ئاغا عەلادین

# بۆ ئەوەی سەرنجڕاکێش بیت!

سەرنجڕاکێشیو جوانی دوو چەمکی جیاوازن، مرۆڤ لەوانەیە جوان بێت، بەڵام سەرنجڕاکێش نەبێت، بۆئەوەی سەرنجڕاکێش بیت ئەوا هەوڵبدە:

١- خۆت لەگەڵ ناخی خۆت پەیوەندییەکی بەتینو تەندروستت هەبێت، چونکە هەر خۆت دەبیتە پاڵپشت بۆ سەرکەوتنەکانت.

٢- وتە بەنرخەکە لە بیر مەکە کە دەڵێت: «بێ دەنگی چەکە، کەم گوتن زێڕە، زۆر بڵێی بەلایە». بێ دەنگیو کەم وتن بۆ دروستبوونی تێکەڵاویو سەرنجڕاکێشی کاریگەری زۆر باشی هەیە، بەڵام بێ دەنگی نابێت لە رووی شەرمو بێ متمانەیی بەخۆبوون بێت، چونکە لەم حاڵەتەدا لە سەرنجڕاکێشیت کەم دەکاتەوە.

٣- هەنگاوی یەکەم بۆ سەرنجڕاکێشیت ئەو کاتەیە کە بەنەرمو نیانیو لە سەرخۆ قسە لەگەڵ بەرامبەرەکەت دەکەیت. چونکە نەرمو نیانی پێگەیە بۆ سەرنجڕاکێشی بە پێچەوانەی مرۆڤی توندوتوڕە کە هەرگیز بۆ پەیوەندیو تێکەڵاوی ناگونجێتو سەرنجڕاکێش نابێت.

٤- ئاکارو رەوشتی جوان هاندەرە بۆ بەرامبەرەکانت و سەرنجی ئەوان بەرەو لای خۆت کەمەندکێش دەکەیت.

٥- کە لە خەو هەڵدەستی سروتەکان لە بیر مەکە، چونکە ئەوان گیانی بڕوا بوون بە خۆتت لا بەهێز دەکەنو بڕۆ بۆ شوێنێکی ئارامو بە دەنگێکی نزم نزا بکەو بڵێ: (خودایە خۆشحاڵمو دەمەوێ شادمانو سەرنجڕاکێش بمو تەندروستیم زۆر باش بێتو سەرکەوتن لە ژیان بەدەست بهێنم)، لە دوای ئەوە بێدەنگ مەبە، بەڵکو هەوڵ بدەو هەنگاو بنێ بۆ بەدەست هێنانی ئەو ویستانەت.

٦- لە ژیانتدا هەمیشە با زەردەخەنە لەسەر لێوانت بێت، بەڵام ئاگاداربە زۆر پێکەنینو گاڵتەی بێ هۆ لە سەرنجڕاکێشیت کەم دەکاتەوە.

٧- بڕوات بە خۆت هەبێتو ئامانجەکانت دیاری بکە، چونکە مرۆڤی خاوەن بیرو بڕواو کۆششکار بەردەوام بەرنامەیەکی رێکوپێکی بۆ ژیانی هەیەو زۆر سەرنجڕاکێشە.

٨- هەنگاوە مەزنەکە (بەخشینی دیاریت) لە یاد بێت، بەخشینی دیاری بە گرنگترین هەنگاوی نزیکبوونەوە دادەنرێت. بە تایبەتی ئەگەر بەرامبەرەکەت چاوەڕوانی هیچ دیارییەك نەبێت لێتو ئاگاداری بایەخی دیارییەکە نەبێتو نەزانێت بۆ چ مەبەستێکە، ئەو شێوازەی دیاری دەبێتە هۆی بایەخدان بە کەسی بەرامبەرو تێکەڵاو بوون بە رۆحیەتی سەرنجڕاکێشی.

٩- قسەو بیروڕایەکانت بایەخی تایبەتییان هەیە، بە قسەی شیرینو جوان گیانی خۆت بە هێزو شاد بکە، دوورکەوتنەوە لە وشەی (ناتوانم، نابێت، نەخێر،..... هتد) لەگەڵ دڵتەنگیو بێزاریو روگرژی لە بەرامبەرەکانت دوورت دەخەنەوە.

١٠- هەمیشە بیر لەوە بکەرەوە، کە دەتەوێت ژیانێکی خۆشو پڕ لە کامەرانی لەگەڵ خێزانەکەتو هاوڕێکانتو بەرامبەرەکانت بەسەر بەری.

# ڕەنگە بڵێیت ناتوانین بەڵام دڵنیابە دەتوانین!

و/ لە فارسیەوە :حەمیدە موحسین

زۆر گوێبیستی ئەم رستەیە دەبین:

دنیا زور پیس بووە، ئیتر هیچ هەواڵیك لە خۆشەویستیو میهرەبانی نییە، بێوەفایی رەنگی داوەتەوە، هەموو شتیك بووەتە پارەو سامانو...هتد.

من دەپرسم ئایا بە وتنی ئەم رستانە دنیا پاك دەبێتەوە؟

نەخێر، بە وتنی ئەم رستانە ئەو ڕووداوەی کە ڕوودەدا، ئەوە زیاتر خەمگین دەبین.

کەواتە دەبێت کارێك بکەین، بەڵام چ کارێك؟

لەوانەیە نەتوانین برسێتیو هەژاریو جەنگ بنەبڕ بکەین، یاخود کارێك بکەین کە خەڵکان هەموویان بە ویژدان بن، بەڵام دەتوانین لەبیری کەسانێکدا بین کە دەمان بینن و خۆشیان دەوێینو خۆشمان دەوێن.

دەتوانین کاتێك کە هاوڕێکەمان دڵتەنگو ناڕەحەتە لە بیری چارەسەر بین بۆی.

دەتوانین هەموو ئەو کوڕو کچانەی کە دەیانناسین، بەڕاستی وەکو خوشكو برای خۆمان خۆشمان بوێنو تا ئەو جێگایەی کە دەتوانین لە بواری جیاجیادا یارمەتییان بدەین.

لەوانەیە نەتوانین یارمەتی هەموو مناڵە هەژارەکانی دنیا بدەین، بەڵام دەتوانین لە یەکێك لەو مناڵانەی کە لە پشت گڵۆپە سورەکانی ترافیك لایتەوەن یەك تا دوو بنێشت بکڕین.

یا لەوانەیە نەتوانین هەژاری بنەبڕ بکەین، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەتوانین لە مانگێکدا بە پێی توانای خۆمان بڕە پارەیەك بخەینە نێو سندوقی خێرخوازی.

لەوانەیە نەتوانین هەموو مرۆڤەکان باش بکەین، بەڵام دەتوانین بە لایەنی کەمەوە لە هەڵبژاردنی هاوسەردا وردبینو سەرەڕای هۆکارەکانی تر لەگەڵ مرۆڤێکی میهرەبانو مەنتیقیدا ژیانی هاوسەری پێك بهێنین.

لەوانەیە دنیامان پیس بووبێت، بەڵام ئێمە دەتوانین بە پاکی بمێنینەوە.

لەوانەیە هەندێك کەس بێباوەڕی بە ڕۆشنبیری لە قەڵەم بدەن، بەڵام ئێمە بە هێزەوە دەڵێین: ئێمە عاشقی خوداینو بە رەوشتە گرنگەکانی پابەندین، بەڵام لە هەمان کاتدا لە دەمارگیری خۆمان دەپارێزین.

لەوانەیە هەموومان دڵی یەکتر بە بەهانەی مەنتیقی بشکێنین، بەڵام ئێمە دەبێت هەوڵ بدەین کە ئەگەر یەکێك عاشقی ئێمە بوو، بە هەر هۆکارێك نەمانتوانی هاوسەرگیری لەگەڵ بکەین، دەبێت بە هێمنانە خۆمان لەو هۆگرییە رزگار بکەینو ئەگەر نازانین لە راوێژکارێك یارمەتی بخوازین.

لە کۆتایدا، دەبێت شتێکمان لە یادبێت کاتێك تەمەنمان گەیشتە ٨٠ ساڵ پێویستە پاکی منداڵیمانو سەرگەرمی لاویمانو شارەزایی تەمەنی پێگەیشتوومان بپارێزین.

دواتر نابێت لە پێناو خۆمان حەق بە ناحەق لە قەڵەم بدەین، هەمیشە باش بین هەمیشە...... هەمیشە.

سەرچاوە: موفقیت.

# چۆن چێژ لە ژیان وەرگرین؟



مرۆڤەكان ئەمڕۆ بەشێوەیەك سەرقاڵی ئیشو كارو بە ئەنجام گەیاندنی كارەكانیانو بونیاتنانی ژیانن كە هیچ كاتێكیان لەبەردەستدا نەماوەتەوە بۆ چێژ وەرگرتن لە ژیانو سوود بینین لەو دەستمایەیەی كە هەیانە، هەندێ جار خەمی داهاتوویان نییەو ئەمڕۆشیان لە دەست دەدەنو ڕێگەی ڕۆیشتن بەرەو لای پەروەردگارو كەماڵ چوون ونو بزر دەكەن.

بە بەكارهێنانی ئەم چەند خاڵەی خوارەوە دەتوانن ئەكتیف بوونو كاریگەری ژیان زیاد بكەنو لە كاتەكانی ژیانتان چێژ وەرگرنو لە هەر جۆرە زیادەڕەویو شلگیرییەك بەدوور بن.

«ڕپێكتت» دەڵێت: ئەگەر كەسێك خۆشبەختو بەختەوەر نییە ئەوا هۆكەی خودی خۆیەتی، چونكە خوای گەورە هەموو كەسێكی بە بەختەوەرو خۆشبەخت دروستكردووە، هەر شتێك لە حاڵەتی مامناوەندی خۆی بەرزتر یان نزمتر بوویەوە ئەوا دەبێتە هۆی گرفتو نارەحەتی، وەك باوەڕ بە خۆبوون، كە تایبەتمەندییەكی زۆر باشی هەیە، بەڵام باوەڕ بەخۆبوونی زۆر دەبێتە هۆی خۆبەگەورەزانینو غرورو لە خۆبایی بوونو كەمتر لە شێوەی ئاسایی دەبێتە هۆی خۆ بە كەمزانین.

خۆشەویستی زۆر بۆ شتێك كەمتر لێی دەبێتە هۆی دڵرەقی، زیادەڕەوی كردنو زۆر ڕۆچون لە پاكو خاوێنیدا دەبێتە هۆی ڕاڕایی بوونو وەسواسیو كەمتر لەوەش دەبێتە هۆی پیسو پۆخڵیو چەپەڵی، ئەگەر ژیان تەنها بە ئیشو كار یان بە خۆشی بیگوزەرێنی، ئەوا لە داهاتوودا دەبێتە هۆی نارەحەتیو یەك شێوەبوون، نابێتە وەڵام دەرەوەی پێداویستییەكانی مرۆڤ، بەڵام باشترین كات تێكەڵی كردنو هەوڵو كۆششو پشوودانە، هەروەها ئاستی مامناوەندی لە ژیانداو لە هەموو كارێكدا دەبێتە هۆی ئەوەی كە چێژی زیاتر لە ژیان وەرگرین.

«دیل كارینگی» دەڵێت: دوێنی كە چیتر تێپەڕیو سبەینێش كە هێشتا نەهاتووە، لە گەورەترین هەڵەو خواستەكانی مرۆڤ ناڕازی بوونیەتی لە ئێستای كە تێیدا دەژیو هیواو ئومێدیەتی بە داهاتووی نەناسراو، لەو كاتەی كە تێیدا دەژیت هەوای پاك هەڵمژەو چێژو



و: دڵنیا جەعفەر عەلی

خۆشی وەرگرەو سەرسورمانێك دروست بکەو لەوەی کە مرۆڤیت ئەوپەڕی سودو بەهرە وەربگرە.

زۆرێك لە خەڵك ئێستا لەسەرەتای رابوردووەکاندا دەژینو بیر لە دیمەنو وێنەی ناخۆشیو شکستو دۆڕاندنەکانی رابردوویان دەکەنەوەو کاتە زێڕینەکانی ئێستایان لە دەست دەدەن، وەك بڵێی هەمیشە سبەینێو رۆژێکی دیکە لە پێشدایە.

بەڵێ هەموو رۆژێك لەسەر سفرەی بەیانیاندا بە خۆت بڵێ: ئەمرۆ رۆژێکە کە پێویستە ئەوپەڕی چێژی لێ وەربگرمو رێزو نرخی کاتە زێڕینەکانی بزانم، بەڵێ هەموو رۆژێ موعجیزەو سەرسورمانێکە.

* ئاسودە بژینو نارەحەت مەبن:

«دەیوید هیوم» دەڵێت: خۆشبەختی وەك پەپولەیە، ئەگەر بەدوایدا بڕۆن لێتان هەڵدێتو رادەکات، بەڵام ئەگەر ئارامگربن لەسەر سەرتان دەنیشێتەوە، بەراستی نارەحەتیو گیرو گرفت بیرو زەینی خەڵکی ئێستای داگیرکردووە، کە هەر خودی خۆمانین دروستمان کردووەو بووەتە هۆی ئەوەی کە بیرکردنەوەی خراپ جێگەی هێزی باشە بگرێتەوە، لە ژیاندا رێگری لە هەموو جۆرە تەممەڵییەك بکەن، چونکە وەك شێت بە دوای یەك جۆر مەبەستو یەك شتدا چوونو گەران هەڵەیە، بە لەسەرخۆییو ئارامی دەتوانیت زۆر باشتر بیر بکەیتەوەو کردارو رەفتارەکانت هەڵسەنگێنیو هەڵەکانت راست بکەیتەوەو ژیانێکی نوێ دەست پێبکەیتو دەتوانیت لە کەسە سەرکەوتووەکانەوە ئەزموون وەربگریت.

* خەندەو پێکەنین باشترین دەرمانن:

«شکسپیر» دەڵێت: خۆشبەختو بەختەوەر کەسێکە کە رووبەرووی گرفتو نارەحەتییەکانی ژیان پێبکەنێت، یەکێك لە گەورەترین بەرپرسیارەتییەکانمان لە بەرامبەر خەڵکانی دیکەدا ئەوەیە کە دەبێت شادو دەم بە پێکەنین بینو چێژ لە ژیان وەرگرین، مرۆڤی شاد بە درێژایی رۆژگار هەستی باشو لێهاتوویی باشترە، کاتێك کە ئێوە شادو خۆشحاڵن، خۆبەخۆ دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکانی دیکەش شادبنو لە شادییەکانی ئێوەدا بەشداربن، پێکەنین خەمو دەرد ناهێڵێتو لە ناوی دەبات، لە کاتی نارەحەتیو گرفتەکانیشدا با خەندە لەسەر لێوتان نەبڕێت، چونکە هەر ئەم خەندەیە دەبێتە بەشێك لە ئارامیو ئاسودەیی دەروون، بە پێکەنین جوانتر دەبنو ئارامو دامەزراو دەچنە پێشەوەو ئارامیو ئاسودەیی بە مێشكو زەینمان دەبەخشرێتو هەستی بەرەوپێشچوونمان بۆ دروست دەبێتو هەناسە هەڵمژینمان وەك کاتێکی لێدێت کە وەرزش دەکەین.

* چۆن هەست بە میهرەبانیو شادی بکەین؟

«لوئیزوهی» دەڵێت: خۆشەویستی دەرمانی سەرسوڕهێنەری هەموو دەردێکە.

هەروەها «لاشنگو» دەڵێت: خۆشبەختترینی خەڵك کەسێکە هەوڵ بدات خەڵکانی دیکە خۆشبەخت بکات.

هەوڵ بدەن لە پەیوەندییەکانتان چێژ وەرگرن، بە خۆشەویستییەوە لەناو کۆمەڵگەدا هەست بە خۆشحاڵی بکەن، یارمەتی خەڵکانی دیکە بدەنو مرۆڤەکانتان خۆش بوێت، چونکە دەبێتە هۆی گەورەبوونی کەسایەتی خۆتان، بە بژارکردنی خۆشەویستی دەتوانن دۆستو هاوەڵی باش، کە دەتوانن رۆڵیان لە بەرەوپێشچوونی ئێوەدا هەبێت، پەیدا بکەن.

دواجار دەبێ ئەوە بڵێین: کە بۆ خۆشحاڵبوون، هۆکار زۆر پێویست نییە، بە وتەی «دکتۆر سیدا» ژیان وەك منداڵی تەماشاکەنو چێژی لێ وەربگرنو پارەو پوڵو سامان بە هۆکاری خۆشحاڵبوونتان مەزانن، بۆ نموونە مەڵێن: دە ملیۆن دینارم هەبوایە هیچ کێشەو گرفتێکم نەدەبوو! هەمیشە خۆشحاڵ دەبووم، کەواتە هەر بەو شتانەی کە لەبەردەستتاندایە خۆتان بە خۆشحاڵ بزانن‌و شوکرو سوپاسی خوای گەورەش بکەن.

سەرچاوە: گۆڤاری راه زندگی.



# کانی!!

یوسف واژەیی

له ئاسمانێکی سامالو بێ هەورو تەم، لێزمە بارانێکی خوڕەم، دایکردۆته سەر مەزرای ئەم دڵه پڕەم، لە ناوجەرگەی ئەم باخەشا، کانییەکی زولاڵی لێ هەڵقوڵیوه، که بۆ سەرجەم ئەندامانی تری جەستەم، سەرچاوەی گەشەو بژیوه، شەونمی گوڵی چاوانم، هەڵمو تەم تومانی ئەوه دارستانی چڕی ناخم، سەوزو شێدارو بەردارو تەڕی بێگومانی ئەوه، سەرووی باڵا شاجۆگەی له گیانی ئەوه گەشەو چرۆو پشکوتنی له بەردەوام بوونو بوونو مانی ئەوه، ئێستە کانی بۆته سەرچاوەی شکۆفەو ئاوەدانی دارستانو باغستانی هەناوی من، هۆی برەوی تاجو رەواجی ناوی من.

بۆیه نەمامی قامەتم هەر چوار وەرزه سەوزو بەرزه، چونکه شارەگی لەو ئەرزه داکشاوه، ورده ریشاڵی له وەردی ئەو زەمینه راکشاوه.

تینوێتی شکاندنی له ئەو کانیو سەرچاوەیه، گەشاوەی ئەو کەشاوەیه، شەلاڵی ئەو شەواوەیه، تێراوی ئەو دێراوەیه.

ئێسته کانی بۆته رووبار، بۆته دەریا، له جیاتی قوڵپو هەڵقوڵین بۆته هاژەو شڵپەو شەپۆل، سەمای هەڵچوونو داچوونو به گژی کەنارا چوونو هاتنو چوونی گۆلاو گۆل.

دەریاش وێڵو دەربەدەره، چاوی عەشقی وێنەی جوانیو ئاوێنەی عەکسی قەمەره.

شنەبای کەنارەکانی بۆته بزوێنەری کەشتی گەشتی رۆحم، یاقووتی قووتی گیانمه هۆی گەشیو گەشەو مانمه.

کانی دایکی تاڤگەی به خوڕو له گوڕه، داینەمۆی تەزووی ئارەزووی ناخی سڕه، هەوێنی خەفەت ڕەوێنی ئەم ژینەیەو ژوانگەی پەلکه زێڕینەیه، پەلکه زێڕینەی رەنگاڵەی دەوروبەرم، کەوتۆته وێزەی ئاوێزەی هەستەوەرم.

له مێژەوه بەم حەزو تاسەو چێژەوه فرچکم له سینەی کانی که گوتووه تامو کامم لەو شەرابه خۆشو بێ خەوشه بردووه.

لەو کاتەوه هەتا ئێستا جۆگەلەی کانی به جوانی هەر ئەرژێتو هەڵئەرژێته دەروونمەوه، ئەبارێته ئاخی ناخی بێروونمەوه، راستەوخۆ پەیوەندی هەیه به ژیانەوەو به بوونمەوه، به ئایدیاو بۆچوونمەوه.

بۆ بەدیهێنانی ئەم حەزو مەرامه هاژەو راژەی بەردەوامه، تەواو نابێ هەڵقوڵانی قەت نابێته کوێرەکانی.

ئومێدو شەوقو شوومه، نووری دڵی تەنورمه.

وزەو چالاکی جەستەمه ئیرادەی گرژیو تەنگژەی رۆژانی سەختو ئەستەمه بادەی سادەی ئەم سەره کاسو مەستەمه.

رێژنەی دێبەری فیکرمه، خوێنی دەماری شیعرمه، خێروبێری خەرمانی بەر فراوانی دەفتەری یادەوەریمه، فریشتەی نیگای هۆنراوەو پەڕی شاباڵی پەریمه.

هەوێنی ژیانو ژیارمه، هەتوانی ژانو ژوارمه.

یاوەری کۆنو پێشترو ئێستەش هاودەمو یارمه.

مەشخەڵی رووناك کەرەوەی دالانی تاری مێژوومه.

پێوەری پەندو عیبرەتو ئامۆژگاری رابردوومه.

ئەستێرەی رێنیشاندەری داهاتوومه.

نامەی ئاکارو بەرنامەی کاری راستو راهاتوومه.

بەهۆی ئەوبوو هەرچی توانیم هەرچی زانیم کانی ئاودێری ناودێڕی وشەو جوانیم، بۆته سەرچاوەی مەعریفەو هزرڤانیم.

# نرخی ڕاستەقینەی ژیان

کات ڕۆحی گەردونە، نرخی ڕاستەقینەی ژیانە، ناکڕدرێت هەروەك چۆن نابەخشرێتو ناگەڕێتەوە، بەڵام بە هەدەردەدرێتو لەدەست دەچێت، کات داینەمـۆی ژیانە، وزەی جوڵەو گەشەو مانەوەو بەرەوپێشچونە، هەموو کارێك پێویستی بـە کات هەیەو هەمـوو کاتێکیش پێویستە کارێکی تیا بە ئەنجام بگەیەنین، بە باش سوود وەرگرتن لە کات تەواوی بارودۆخی ژیانمـان دەگۆڕێـتو دەمانگەیەنێتە لوتکەی هیواو ئاواتو ئامانجەکانمانو لە ژێر سێبەری بەختەوەریـدا پشـومان پێدەداتو شـەرابی سەرکەوتنمان پێ دەنۆشێت، بە هەدەردانیشی بـەرەو بەدبەختـیو بێـزاریو پەشـیمانیو مایەسـوتاویو دەسـتخەڕۆیمان دەبات.

کات گـەورە هـۆکاری پێویسـتو سـەرەکیو کاریگـەرە بـۆ گەیشـتن بەویسـتو مەرامەکانو گەورە تێکدەریشـە، ئەگـەر بمانەوێت گۆڕانکاری لـە دیاردەیەکـدا یـان لـە بارودۆخـی ژیانماندا بەدیبهێنین، پێویستە هۆکاری زەمەن بهێنینە ناو هاوکێشەکەوە، ئەگەرنا کارو پرۆژەکانمان خەیاڵیو پـەرشو بڵاو و بێ بنەما دەبێتو ڕەنگە نەگەینە بەدیهێنانیانو نەیان پێکینو کۆتایش بە تەمەنی خۆمان یان بە گرنگی ئەو بەرنامەیە بێت.

دەبێـت لە بیرمان بێـت داروبەرد دەبن بـە ئەڵماس ئەگەر کاتێکـی زۆریان هەبێت، بەڵام بەداخەوە هیچمان پێی ناگەین، چونکە تەمەنـی خۆمـان زۆر لـەوە کەمتـرە هەر وەك وتراوە «ئەگـەر مێرووڵە کاتی تەواوی هەبوایە شاخەکانی دەگواستەوە»!

با لە خۆمـان بپرسـینو بزانین چیمان کردووەو چەندە کاتی خۆمان سوتاندووەو لە مەودوا چی دەکەینو کارو پرۆژەمان بۆ ئایندە هەبێتو بەرنامەو خشـتەی ڕێكو پێکمان بۆ ژیان هەبێتو بزانین تەمەنی خۆمان لە چیدا بەسەر دەبەین، هەریەك لە ئێمە بیستوچوار کاتژمێـر کاتمـان هەیە لە شـەو و ڕۆژێکدا، بەڵام کەسـانی سـەرکەوتوو دەرکەوتوو لەو ماوەیەدا هەوڵو تێکۆشان دەکەنو دەزانن هەر چرکەیەك نرخی کارێکەو ئەگەر بە بەتاڵیو شـتی بێ کەڵكو بێ سـود بـە کاری بهێنن ئەوا خەریکە ژینـی خۆیان لە بەین دەبەنو کەسـانێکیش هەن بە (هیچ نییەو فشـەیەو کات هەردەڕوا!؟) بە سـەری دەبەنو تاکۆتایی تەمەنیـان نازانـن چییان کـردووە، زانایەك دەڵێت: (ئەی مرۆڤ بزانە تۆ بریتی لە چەند ڕۆژێك، ئەگەر ڕۆژێکت ڕۆیشـت ئەوا بەشێك لە تۆ ڕۆیشـتووە)، هەروەهـا عومەری کوڕی عبدالعزیـز دەڵێت: (شـەو و ڕۆژ کارت تێدا دەکەن، تۆش کاریان تێدا بکە)، بەڕاستی کات یەکسـانە بە ژیانو بەرهەمهێنانو داهێنانو ڕوونکردنـەوەی ڕێـگای خـۆتو خەڵکـی تا بتوانین بەردێك بخەینە سـەر بەردو بناغەو بینای ژیانێکی گەشاوەو ئایندەیەکی ڕوناکتر بکێشـینو نەمامێك لە باخی ژیان بڕوێنین، تا سبەی لە سایەو بەرهەمەکەی سودو کەڵك وەربگرین، لە پێناوی سـود وەرگرتنی زیاتر لـەم سـەرمایە گرنگـە، ئەم چەنـد خاڵەی خـوارەوە دەخەینـە بەرچاو بـەو هیوایەی سودو کەڵکی هەبێت:

* ڕێکخستنو پێشخستن: ئەو کارانە بنووسەو ڕیزیان بکە کەدەتەوێت ئەنجامیان بدەیتو پاشان بەپێـی گرنگیان ڕێکیان بخـەو پلە بەندییان بۆ بکەو بەرنامەی ماوە کـورتو مامناوەندیو ماوە درێژت هەبێت، بزانە بۆ چ ئامانجێك تێدەکۆشیت، دەستنیشانی بکەو هەوڵی بۆ بدە.

* دوانەخسـتن: ئەگەر کارێك لە لیسـتی کارەکاندا هەبوو یـان دەبوو ئەنجامی بدەیت، بـەڵام چەند جارێـك دوات خسـت بزانە تۆ موماتەڵەو ئەمڕۆو سبەی بە کارەکانت دەکەیتو لە خۆت بپرسە چی دەبێ ئەگەر ئەمە نەکەم؟ تـا چەند گرنگە؟ ئەگەر وتت: کارێکی گرنگە، ئەنجامی بدە، خۆ ئەگەر وتت: کارێکی گرنگە، بـەڵام ڕەنگە کەسـێکی تـر ئەنجامـی بدات، دەستنیشانی بکەو پێی رابگەیەنەو بزانە کێیە دەبێت ئەو کارە بـکات؟ خۆ ئەگەر وتت هیچ نابێـتو گرنگ نییـە وازی لێ بهێنە، هەرگیز کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەی گەر توانیت کاری سبەیش ئەمڕۆ ئەنجام بدە.

* تایبەتمەنـدی: لە کاتێکـی دیاریکراودا کارێکی دیاریکراو ئەنجام بدە تاکو وردبینانەترو خێراترو باشتر ئەنجامی بدەیت.

* دووجار سوود وەرگرتن لە کات: کاتێك دەچیـت بۆ لای دکتۆرێك یـان مەوعیدێکت لەگەڵ کەسـێکدا هەیە یا ڕەنگە سـەفەرێکی دوورت هەبێـتو چەنـد کاتژمێرێـك لـە ئۆتۆمبێلـدا بەسـەرببەیت، بۆیـە دەتوانیت سـود لەو کاتـە وەربگریـت بەخوێندنەوەو بیرکردنەوەو.....هتد.

* کاری چاککـردن لەپێـش چـاك کارکردنیشەوەیە: ڕەنگە کاتی تەواومان نەبێت بۆ هەموو کارەکان، بۆیە پێویستە کام کارە زۆرترین سوودی هەیە پێش کارەکانی تری بخەین.

* کەمکردنەوەی سەیرکردنی تیڤییەکانو کورتکردنەوەی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکان.

* یەك خولەك چاو نوقاندن شەست چرکە ڕووناکـی خۆرت لـێ ون دەکات، خەوتن بە پێی پێویست، چونکە خەوی زیاد لە پێویست کات فەوتاندنو دووبـارە ماندوبوونەوەیەو دواکەوتنە لەرێڕەوی ڕەوتی ژیان.

تۆ بریتی لە کات ئەگەر ئەتەوێت هەبیت کات بە فیڕۆ مەدەو ئەگەر ئەشـتەوێت کات بە فیڕۆ نەدەیت پلان دابنێ، پەلەبکەو هەر ئێسـتا هەنـگاو هەڵبگرە لە پێنـاو ژیانێکی باشترو ئایندەیەکی گەشتردا.

زاهیر زانا



# هێزی متمانە بەخۆبوون!!

شاد پێنجوینی

یەکێک لە کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانی ئەمریکا رایگەیاند: سەعات هەشتی ئێوارە، راستەوخۆ لەو هۆڵەی ئاهەنگی رێزلێنانو خەڵاتپێدانی باشترین فرۆشیاری ئەمریکای تیا دەکرێ، بەرنامەیەک پێشکەشدەکات، کاتی بەرنامەکە هاتو ئامادەبوویەکی زۆر لە هۆڵەکەدا هەبوون، سەیر لەوەدابوو ئەوکەسەی خەڵاتەکەی بەدەستهێنا، کیژۆڵەیەکی نۆ ساڵان بوو، لە ماوەی کەمتر لە شەش مانگدا، چل هەزار پاکەت پسکیتی فرۆشتبوو٠ کاتێ هاتە سەر سەکۆی بەردەم ئامادەبووانو بەردەم کامێرای تەلەفزیۆنی، گشت لایەکی بە متمانە بوونی بە خۆی سەرسامکرد٠ پاش وەرگرتنی خەڵاتی باشترین فرۆشیاری ئەمریکاو چەپڵە رێزانی ئامادەبووانی هۆڵەکە، ،پێشکەشکاری بەرنامەکە لێی پرسی: لە ماوەیەکی کورتدا، چۆن توانیت چل هەزار پاکەت پسکیت کە برێکی زۆرە، بفرۆشیت؟! کیژۆڵە نۆساڵانەکە لە وەڵامدا وتی: (تەمەنم پێنج ساڵان بوو، ئەو باوکەی کە زۆر زۆرم خۆشدەویست، ماڵئاوایی لە ژیان کرد! ئیدی هەستم زۆر بە تەنیایی دەکردو تووشی خەمبارییەکی زۆر بووم، بەڵام لەسایەی خواوە، پاشان بە یارمەتی دایکی لەدڵا شیرینم، بەسەر ئەو گرفتەدا زاڵبووم٠ دواتر زانیم کە دایکیشم نەخۆش کەوتووە، نەخۆشییەکەشی چی بێ؟ نەخۆشییەکەی هەتا بڵێی سەخت بوو، ئەویش شێرپەنجە! دکتۆرەکانیش پێیان وتبوو: تەمەنت ئەگەر مابێتی، لە ساڵێک زۆرتر نییە٠

تەواو هەستم بە بێکەسی خۆم دەکردو دەمزانی کە دایکم سەفەری بۆ هیچ جێیەکی جیهان نەکردووەو خەونو خولیای ژیانیشی ئەوەبوو کە سەردانی چەند وڵاتیکی دیکە بکات٠ پاشان زانیم: پێشبڕکێیەکی فرۆشەمەنی هەیەو خەڵاتەکەشی بیست هەزار دۆلارو گەشتێکە بە جیهاندا٠ لە پێناوی دایکی لە ئازیزم، بڕیارمدا بەشداری ئەم پێشبڕکێیە بکەمو لەدڵی خۆمدا وتم: ئاستەنگو لەمپەرەکان هەرچییەک دەبن، بابن٠ پاشان لێبڕامو چوومە پێشەوە، کەچی ئەندامەکانی لیژنەی هەڵسەنگاندن، لەبەر کەمی تەمەنو نەبوونی شارەزاییم لە بواری فرۆشەمەنیدا، قبوڵیان نەکردمو منیان رەتکردەوە٠ بەڵام بێ هیوایی رووی تێنەکردمو ئەوەندە پێداگرییم کرد، هەتا لە بەردەم پێداگرییەکەمدا، جگە لە رازیبوون، چارەیەکی دیکەیان نەما٠ جا بەڕاستی دەستمدایە کارەکەمو بەرنامەکەشم ئەوەبوو: هەر دەرگایەکم بەرچاو دەکەوت، تەقەم لێدەداو پاش کردنەوەی، دەموت: من کچێکی نۆ ساڵانم، دایکێکم هەیە تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووەو دکتۆرەکانیش پێیان وتووە: ئەگەر ژیانت لەم سەر زەوییە زۆر زۆری مابێ، لە ساڵێک زۆرتر نییەو خەونو خولیای ژیانیشی ئەوەیە: بەرلەوەی رۆحی شیرینی دەربچێ، گەشتێک بە جیهاندا بکات٠ لێرەدا ئەوەی من لە دەستم دێ، فرۆشتنی ئەم پاکەتە پسکیتانەیە، هەتاکو خەڵاتەکە ببەمەوەو بەر لەوەی دایکم سەر بنێتەوە، خەونەکەی بێتەدیو گەشتەکەی بکات)٠ پاشان کچۆڵە نۆساڵانەکە درێژەی بە قسەکانی داو وتی: (پاشتر لە کڕیارەکە نزیک دەکەوتمەوە، لە هەردوو چاوانیم دەڕوانیو بە دەنگێکی بە سۆزەوە کە دڵی بەردی دەکرد بە ئاو، هەروەها بە لەخۆڕابینینێکی تەواوەوە، لێم دەپرسی: بەڕێزتان بۆ ئەوەی هاوکاریم بکەن، خەونەکەی دایکم بهێنمە دی، چەند پاکەت پسکیتتان دەوێ؟ بەوە تێکڕا پێنج پاکەتە پسکیتم دەفرۆشت بە هەر ماڵێک کە سەردانم دەکرد)٠

وەختێک بەرنامەکە کۆتایی هات، کیژۆڵەکە هەلی بە دەرفەت زانی، یەکسەر روویکردە کامێراکە، هەتا پەیامەکەی بە بینەران بگەیەنێو وتی: (بەسەرهاتی منتان بیست، باش دەزانن ئەوەی دەیکەم بۆ یارمەتیدانی دایکی لە دڵا شیرینمە، تا خەونەکەی بێتەدی، دەی چەند پاکەتە پسکیتتان دەوێ؟!)٠

بەمە ئاگری لە دڵو هەناوی هەمووان بەرداو توانی سۆزی هەزاران بینەر بەدەستبێنێو حەفتا هەزار پاکەتەپسکیتی دیکە بفرۆشێ!!!

سەرچاوە: قوه التفكير: إبراهيم الفقي٠



و/ لە فارسییەوە
هەردی ئەنوەر

# هونەری نەبینینو نەبیستن!!!

(شیوانا) لەگەڵ قوتابییەکانی دەچووە بازاڕ. لەوێ هەندێ گەنجیان بینی لەگەڵ کوڕی ئاغا کە سەریان خستبووە سەر کابرای میوەفرۆشو لە پێش چاوی خەڵکی قسەی ناشیرینیان پێ دەگوت. بەڵام کابرای میوەفرۆش جۆرێك هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردن کە دەتگوت لەگەڵ ئەویشیان نییە... وەك شتێکی نەبیستبێو نەبینیبێ. بەڵام لە ناکاو کابرای میوەفرۆش سەری بەرز کردەوەو بێ ئەوەی هەستێکی نارەحەتیو بێتاقەتی لە دەمو چاویا دەربکەوێ، زۆر بەساردو سڕی تەماشای گەنجەکانو کوڕی ئاغای کرد. دووبارە سەری خۆی داخستو دەستی کردەوە بە کار کردن. بەم کارەی کوڕی ئاغا سەری سوڕماو هاوڕێکانی کۆکردەوەو شوێنەکەیان بەجێهێشت. قوتابییەکانی (شیوانا) لە خۆڕاگریو ئارامی میوەفرۆشەکە واقیان وڕماو هۆکاری دەرچوونی کوڕی ئاغاو هاوڕێکانی لە (شیوانا)یان پرسی... (شیوانا) بە پێکەنینەوە وتی: وەرن با بچین لە خۆی بپرسین! لە پاشان لەگەڵ قوتابیەکانی هاوڕێی چوونو (شیوانا) وتی: هاوڕێیانم دەیانەوێ بزانن کە هۆکاری ئەم بێدەنگیو لەسەرخۆییەت لە چیدایە؟

کابرای میوە فرۆش کە (شیوانا)ی زۆر بە باشی دەناسی وەڵامی دایەوە: بینیتان کە کوڕی ئاغا لەگەڵیانەو من لەسەر بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیان هیچ شتێکم نییەو کاریشم پێی نییە، کە شتێکم هەبێ. بۆیە لەم رووەوە هیچ شتێکم لە دەست نایەت. بەڵام بە پێچەوانەوە ئەوە کە فکرو گوێو چاوی خۆم هەیە! بۆیە بۆ تۆڵە کردنەوە لەم جۆرە مرۆڤانە چاوم بۆ بینینی شێوازو رووخساریان کوێرو گوێم لە بەرامبەر قسەکانی ئەوان کەڕ کرد. کاتێك شتێك لە بەرامبەر خۆم نابینمو گوێم لە دەنگێکی بێزارکەر نابێت، ئیتر بۆچی خۆم بخەمە کێشەو نارەحەتییەوەو حورمەتو رێزی خۆم بهێنمە خوارەوە. قوتابییەکانی (شیوانا) پرسیان: ئەی بۆچی کاتێك تەماشای ئەوانت کرد، ئەوان ئەو شوێنەیان بەجێ هێشت؟

کابرای میوەفرۆش وتی: خەڵکی هەموو ئاگادار بوون کە کاتێك من تەماشای ئەو لایەم کرد کە ئەوانی لێبوون، شتێکی وەهام نەدی کە کاریگەری هەبێت لەسەرم. لەراستیدا هەر نەمبینی! چونکە چاوەکانم لە بینینی ئەوان قەدەغە (کوێر) کردبوو. لەسەر ئەوەی کە بۆچی رۆیشتنو شوێنەکەیان بەجێ هێشت لە شیوانا بپرسن! شیواناش بە زەردەخەنەوە وتی: هەر مرۆڤێك کە چاوانێك ئەو نابینێت، ئەو هەست بە نارێکی خۆیو ترسان دەکات. ئەوان لە تەماشاکردنی مێوەفرۆشەکە تەنها بە ئەندازەی یەك دەنکە لمی بچووك خۆیان نەبینی. بەو پەڕی هەستکردنەوە هەستیان کرد کە لە دونیاو خەیاڵی میوەفرۆشەکەدا بوونو نەبوونیان وەك یەك وایە. هەر لەبەر ئەمەش بوو کشانەوە. چونکە تێگەیشتن بەردەوام بوونی کابرای میوەفرۆش لە تەماشاکردنیان کە خەڵکی ئاگاداری بوون، فێریان دەکات کە چۆن ئەوانیش وەك ئەم تەماشا بکەن تا ببنە جێگای بێزاریو نارەحەتی، ئەمەش بۆ کوڕی ئاغاو ئەوانەی لەگەڵی بوون خراپترینو دژوارترین سات بوو کە روویدا. لە بیرتان نەچێ کە ئەم جۆرە کەسانە چەند خولەك لەوەو پێش دەیانویست لە بەر چاوی خەڵکی ئابەوجۆرە ئابڕووی بەرن، مێوەفرۆشیش بە نەبینینو خۆکەڕکردن (نەبیستن)ی دەنگیان هەمان ئەو بێ نرخیو سوکایەتییەی بەسەرخۆیان شکاندەوە. ئەوان لەبەر ریسواییو بێ نرخی دوارۆژی خۆیان بەجێیان هێشت.

سەرچاوە: موفقیت...شمارە۱۷۷.

# ئاسۆی وێنەیەك

سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو بە دیدو خەیاڵی تیژو هەستی ناسکت بۆی بنوارەو پاشان خامەکەت هەڵبگرەو گوزارش لەو هەستە ناسكو خەیاڵە وردو سۆزە بێ سنوورەت بکە، تا ببیتە خاوەنی یەکێك لەم دوو خەڵاتەی خوارەوە:

- بەشداری بێ بەرامبەری ساڵێکی گۆڤاری بڕیار.
- بەشداری بێ بەرامبەری شەش مانگی گۆڤاری بڕیار.

دوا مۆڵەتیش بۆ وەرگرتنی وەڵامەکان (١٠) رۆژ دوای دەرچوونی گۆڤارەکەیە.



### خەڵاتی یەکەم
**ئازاد محی الدين**
**خورماڵ**

ئەو قەدە دارە کەتۆ ئەیبینی شێواوە شێوەی جوانو رەنگینی جن جنە بەدەست زەبرو بەڵای تەور تەڵاشو پوازی رژاوە لە دەور سەردەمێك ئەویش بۆخۆی ئەشنیا رێبواری رێگا ئەسرەوت لەبنیا لە ناکاو لقێك هەر لەجەستەی خۆی خۆی کردە کلکی دەمە تەور بۆی ئەوسا دوو دەستیش گیربوونە دەستە پوازیش لەخۆیدا چەقی لە جەستە هاکا ئەو تەورە بەسوكو ئاسان رووی کردە هەموو داری دارستان با لەم چیرۆکە سەرنجێك بدەین دەستمان لەپشتی یەکتر بەر نەدەین بۆ دەستی دوژمن نەبینە داردەس چاوەڕێ نەکەین داردەستی لەکەس

# راهێنانی مێشك

**بە وردی لەم وێنەیە**

**ورد بەرەوەو**

**هێزی مێشكو بیركردنەوەت**

**بخەرەكار،**

**بزانە چی دەبینیت؟**

**تا چ رادەیەك دیدی تێروانینت وردە؟**





خەڵاتی دووەم

محمد عەوڵا مێرگەیی

ڕاستە هەردووكمان لەیەك ڕەگەزین
لە دارستاندا بەسەرمان برد ژین
جێگەی ئومێدی سەدان ڕێبواربووین
نەواوسێبەری شوانو مەڕدار بووین
تاجوان بووین جوانی ئەبەخشی هەردەم
كەپیربووین بۆ یەك بووینە مایەی غەم
بەدەست خۆم نییە ئەمری داربڕە
فەرمانەكانی بۆم جەرگبڕە
نیگەران مەبەو خۆت نەشێوێنی
ژیان هەردەبێ وا خۆی بنوێنی
هەردەبێ ئێمە بۆ ئادەمیزاد
ببینە مایەی جێی نیازی شاد
لە ڕێگەی منو بیوری بێ گیان
قەد قەد دەبیتو دەچیە ئاگردان
دەبیە خۆڵەمێش دەبی بە سووتما
بەكارت دێنن بۆ كاری زۆر جوان
ئەوەی گرنگە و جێی تێڕامانە
دیمەنی ئێمە بۆ گشت ئینسانە
لێمان تێ بگاو وردببێتەوە
بەچاوی عەقل بیخوێنێتەوە
نەبێتە هۆكار بە دەستی زۆر دار
تا بەهەدەر دات بەرهەمی هەژار
من بێ گیانمو چارم ناچارە
بەڵام مرۆڤە خاوەن ئیختیارە

## خێزانی بەختەوەر

پەری شێخ کەریم



# مووچەی خێزان پارووپەکی چەورو بۆمبێکی ئامادە!

مرۆڤ بە گشتی بە شێوەیەك دروست بووە کە خۆشەویستی هەیە بۆ پارەو سامان، هەر بۆیە هەرکەسەو بەشێوەیەك هەوڵدەدات بۆ پەیداکردنو کۆکردنەوەی سەروەتو سامان، بە تایبەتی لەم بارودۆخەدا کەنرخی شتومەك هەمیشە بەرەو زیادبوون دەچێت. زۆر جار وا لە مرۆڤەکان دەکات کە یارمەتیدانی یەکتریان لە بیردەچێتەوە، ئەم کارەش دەبێتە مایەی گازندەکردنو نارەزایی دەربڕین لە یەکتریی، لەبەرئەوە لەم ژمارەیەدا بە پێویستمان زانی باس لە مووچەی ئافرەت بکەین کە هەندێجار کاردانەوەی باشو خراپی لێوە پەیدا دەبێت، بۆ نموونە: ئایا مووچەی خێزان دەبێتە تێکدانی ماڵ یا دابینکردنی پێداویستییەکانی ماڵ؟ ئایا دەبێتە بەختەوەری یان دەبێتە هۆی بێزاریو دڵتەنگی؟ ئایا دەبێتە زیادبوونی پەیوەندییە خێزانییەکان یا تێکدانو لە ناوچوونی پەیوەندییە خێزانییەکان؟ یاخود دەبێتە مایەی بیرکردنەوەی ژیرانە بۆ لابردنی نارەحەتیەکانی ژیان یا بە پێچەوانەوە زیاتر سەرفکردنی پارە لە کەلوپەلو شتە بێ سوودەکاندا؟!! هەموو ئەم پرسیارانە کە بە بیری هەمواندا دێت بە پشتیوانی خودا لێرەدا ڕوونیان دەکەینەوە.

زۆر جار گوێبیستی ئەم وتەیە دەبین کە ئافرەت زۆر ماندوو دەبێتو ناچارە کاربکات بۆ پەیداکردنی پێداویستی ژیانو پاشان دەگەڕێتەوە لە کار ناچارە خەریکی ماڵو منداڵ بێت، هەندێ جار ڕەنگە نەتوانێت مافی هەردوولا بە تەواوەتی بدات بە هۆی ماندوێتییەوە، بۆیە زۆر جار هەست بە بێزاریو دڵتەنگی دەکات بە تایبەتی ئەو ئافرەتانەی کە نازانن مووچەکەیان لە چیدا سەرف کردوە.

هەر ئافرەتە بە شێوەیەك بیر دەکاتەوە لە سەرفکردنی مووچەکەی کە دەکرێت بیانکەین بە چەند جۆرێکەوە:

جۆری یەکەم: ئەو ئافرەتەی ئامادەیە مووچەکەی لە پێناوی بەختەوەری ماڵو منداڵیدا سەرف بکات، بە بێ ئەوەی هاوسەرەکەی زۆری لێ بکات، هەست بە لێپرسراوێتی دەکات دەزانێت ماندووبوونێکی زۆری چەشتووە، زۆر کات کەمتەرخەم بووە لە مافیاندا بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانیان بە مووچەکەی قەرەبووی دەکاتەوە بۆیان، بە کڕینی پێداوستییەکان دڵخۆشیان دەکات ئەو کاتە دەزانێت ماندبوونەکەی بە هەدەر نەچووە.

جۆری دووەم: ئەو ئافرەتەیە کە مووچەکەی مانگانە لەگەڵ گۆڕینی مۆدیلاتدا لە کڕینی جلوبەرگو جوانکاریدا بەکاردەهێنێت، بە هۆی زۆری پێداوستییەکانی مووچەکەی بەشی هاتوچۆکردنی ناکات، بۆیە هەندێ جار لە مووچەی هاوسەرەکەی بەکاردەهێنێت ئەمەش دەبێتە مایەی کێشەو ناکۆکی لە نێوان خێزاندا.

جۆری سێیەم: تەنها ئاواتی ئەوەیە کە پارەکەی کۆبکاتەوە بە بێ ئەوەی لە پێداوستی ماڵومنداڵدا بە کاری بهێنێت، تەنها لە خەمی ئەوەدایە باڵانسی لە بانکەکاندا زیاد بکات، جیاوازی دەکاتە نێوان پارەی خۆیو هاوسەرەکەی، ئەمەش هۆکارێکە بۆ دروست بوونی شەڕو ناکۆکی نێوان خێزان، چونکە ئەم جۆرە ئافرەتە حەز ناکات هاوکاری هاوسەرەکەی بکات لە پێداوستییەکانداو هەمیشە توانایی خۆی زاڵ دەکات بەسەر هاوسەرەکەیدا، بەردەوام دەڵێت باڵانسی من لە بانکدا زۆر زیاترە لە باڵانسی تۆ!

ئەمەش کارێکی زۆر ناشیرینەو دەبێتە

شکاندنی هەستوسۆزی هاوسەرەکەی، لێکۆڵەرەوەکان روونیان کردۆتەوە جۆری ئەم ئافرەتانە لە جیاتی ئەرك لەسەر شانی هاوسەرەکانیان کەم بکەنەوە بە مووچەکانیان، بە پێچەوانەوە دەبێتە ئاگرێگ بۆ خێزانەکەی بە سووکایەتی کردنو پاشان بێ نرخ سەیرکردنی ماندوویەتی هاوسەرەکەی، دەروونناسێکی ئەمریکی جەخت لەسەر ئەم ئافرەتانە دەکاتەوەو دەڵێت: (پێویستە لەسەر ئافرەتی مووچە خۆر رێز لە هەستی هاوسەرەکەی بگرێت، بواری دەروونی فەرامۆش نەکات، بۆ ئەوەی شەپۆلەکان کەشتی ژیانی هاوسەرییان تێك نەشکێنێ، هەتا بیانبات بەرەو ژیانێکی نائاسوودە))· ئامۆژگاریان دەکاتو دەڵێت: وتەیەکی ناشیرینە کاتێك ئافرەتەکە بەردەوام ئەم وشانە بەکاردەهێنێت: (بالانسەکەم لە بانکدایە) یاخود (مووچەکەم! یا بڕوانامەکەی من بەرزترە)، رەنگە زۆرجار لە لات وتەیەکی ئاسایی بێت، بەڵام کەسی بەرامبەرت بە شێوەیەکی تر کەسایەتیت هەڵدەسگێنن!

ئاواتە خوازم خوشکان لە جۆری یەکەم بن بتوانن بە ئاسوودەیی بژین لەگەڵ هاوسەرەکەیان دوور لە هەموو کێشەیەك، بە چەند خاڵێك کۆتایی بە باسەکەمان دەهێنین:

* رێزو خۆشەویتی نێوانتان لە بیر نەچێتەوە لە پێناوی پارەو ساماندا، ئەگەر هەموو سەروەتی دنیا کۆبکەنەوە ناتوانن لەدوای لە دەستدانی بەختەوەری جارێکی تر بە ختەوەری بکرن·

* بزانە! هاوسەریتان لەسەر بنەمای سۆزوبەزەیی و یارمەتی دروست بووە، تاشەریك بن لە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکدا، مەڵێ بەرێوەبردنی ماڵو منداڵ تەنها لە سەر پیاوە، بەڵکو بە پێی تواناو بەزەیی خۆت هاوکاری بکە·

* خوشکم بێگومان بە لەوەی کە ئەو ئافرەتانەی کە خۆی بەشەریکی هاوسەرەکەی نازانێت ژیانی دەڕوات بۆ رێگایەکی داخراوو بێ ئامانج، زۆرجار خۆی دەبینێتەوە لە ژیانێکی خۆپەرستی، بێئاگایی لە خۆشی ژیان، بێ هیوایی·

* مووچەکەت با لە کڕینی جلوبەرگ و شتە جوانکارییە بێ بەهاکاندا سەرف مەکە لە کاتێکدا کاتێکی زۆرو ماندووبونێکی زۆر دەدەیت بۆ وەرگرتنی·

بەرنامەیەك دابنێ بۆ کڕینی پێداوستییەکانت هەتا مووچەکە قازانجی لێبکەیت، پاشان بتوانیت یارمەتی کەسانی هەژارو مندالانی بێباوك بدەیت·

هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو خوشکێکی مووچە خۆر دەخوازم·



ئا: سالم ئەحمەد

# مافی دایك و باوك

پەروەردگار هەموو بوونەوەرێکی لە نێرومێ دروستکردووە، ژیانی مرۆڤایەتیش بەوشێوەیە دەستی پێکردووە وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، (ومن کل شئ خلقنا زوجین لعلکم تذکرون)، باوكو دایك ئەو دوو بوونەوەرە خۆنەویستەن کە هەموو ژیانی خۆیان بەشەونخونیو دەردەسەری تەرخان دەکەن، بۆ پێگەیاندنی رۆڵەکانیانو هەمیشە لەغەمی ئەواندانو پەرۆشی خۆشگوزەرانی ئەوانن، لەبەرئەوە·

پێویستە هەمیشە چاکەیان لەبیر نەکەینو بەرێزەوە قسەو هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەین·

باوك ئەو کەسەیە کە حەز دەکات کوڕەکەی لەخۆی باشتر بێت، دایکیش ئەو قوتابخانەیە کە پێشەوا شافیعی لە بارەیەوە دەڵێت: دایك قوتابخانەیە کە ئامادەت کرد گەلێکی رەگەز پاکت ئامادەو پەروەردە کردووە·

رۆژێك دایكو باوکێك کەوتنە ئامۆژگاری رۆڵەکانیانو پێیان وتن:

رۆڵە بەپیری کەوتینە لاتان
رەنجی جوانیمان بێننە بەر چاوتان
ئێشو ئازاری دووگیانی دایکتان
ئارەق رشتنی رۆژانەی باوکتان
لای لایەی دایە بەرۆژو شەوان
خەوی شیرینی لەچاو ئەتۆران
دەستمان دامێنتان لەبیرتان نەچێ
رەنجو زەحمەتمان بەزایە بچێ

پێشینانیش وتوویانە: چی بچێنی ئەوە دروێنە دەکەیت·

مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە لە ئەمرۆدا سبەینێ ببینێو بزانێ کردەوەکانی ئەمرۆ سبەی دێنەوە رێیو چاکەکار بێ لەگەڵ خەڵکیو دایكو باوکی، خوای گەورە دەفەرموێ: [وتلك الایام نداولها بین الناس] واتە: ئێمە ئەم رۆژانە دەست بەدەست پێ دەکەین لەناو خەڵکیدا، دەسەڵاتو جوانیو سامانی کەس تاسەر نییە، دڵدانەوەو دڵنەوایی کردنی باوكو دایك ئەرکی سەر شانی نەوەکانیانە، چونکە کە پیر بوون بیانوویان زۆر دەبێت وەك پیرەمێرد دەڵێ:

پزیسك ئەپرژێ لە پیر وەك کوورە
بەدەست خۆی نیە تۆ لێی ببوورە·

دەگێڕنەوە کوڕێك لەگەڵ باوکیدا کە پیرو پەککەوتە بوو زۆر خراپو لاسار دەبێو ئامۆژگاری کاری تێناکات، رۆژێك لەبەرەو خوارکەیەکدا باوکی رادەکێشێو بەجێی دەهێڵێت، بێ ئاگا لە دەسەڵاتی پەروەردگار، وەك پیرەمێردی فەیلەسوف دەڵێ:

هەندێ لەخۆیدا دەست بەتێلایە
هیچ نالێ رۆژان رۆژی لەدوایە!

ساڵان دێنو دەرۆن هەر تەمێ نابێ تاپیر دەبێو دەکەوێتە لای کوڕەکەی، بیانوی ژنو منداڵ باوکی لێ دەکا بە دوژمنو دێوەزمە دەیبات لە هەمان شوێنی باوایەوە رای دەکێشێ بەرەو خوار، کە دەگاتە شوێنەکەی باوای باوکەی ئێستاو کوڕە لاسارەکەی دوێنێ دەڵێ: رۆڵە لەوە زیاتر رام مەکێشە، چونکە منیش باوکمم تا ئێرە راکێشا، لەوێدا بۆیان دەرکەوت کە پێشینان راستیان وتووە کە دەڵێن:

چی بووەشێنی دروێنەی دەکەی
کردەوەی خۆتە ئەمرۆ پێی دەگەی!

بەو شێوەیە زەمانە هەردووکیان تەمێ خواردەکاتو قوڵپەی گریان دەیان گرێو تەوبە دەکەنو پەشیمان دەبنەوەو چاوی هەردووکیان بە گریان لافاوی پەشیمانی هەڵدەسێننو کوڕە باوکە دەگرێ بە کۆڵەوەو بەرەو ماڵەوە دەیباتەوەو زنجیرەی تاوانی بێ وەفایی لەوێدا کۆتایی دێت·

سەرچاوە: قورئانی پیرۆز- پەندەکانی پیرەمێرد- چیرۆکێکی واقیعی·


زرنگ واژەیی

# پاییزە پیاسەیەكو چەند ئامۆژگارییەك!

پاییز وەرزێكی تاراَدەیەك ساردو باراناوییەو مژدەی هاتنی وەرزی زستانیشە، هەروەها وەرزی هەڵوەرینی گوڵو گەڵای درەختو كۆچكردنی باڵندەكانە، خۆ ئەگەر لەم وەرزە تەڵخەدا پیاسەیەك بە ناو هەندێ لەو درەختە گەڵا وەریوانەدا بكەین ئەوا جێگەی خۆیەتی تێیان رابمێنین بە بەراوردكردنی لەگەڵ ژیانی خۆمان ئەم چەند تێبینیە فێر ببین:

١- درەخت لەگەڵ ئەوەی هەوڵو كۆششێكی زۆریداوە تاوەكو ژمارەیەك گەڵای پێكهێناوەو گەورەی كردوون، بەڵام لەگەڵ هاتنی پاییزدا هەموویان دەكەونە سەر زەوی، رەنگە لەگەڵ هاتنی كزەبایەكیشدا بەجێی بهێڵن، بەڵام ئەو درەختە كۆڵ نادادتو جارێكی دی بۆ دروستكردنی چەند گەڵایەكی تر خۆی ئامادە دەكاتو سەرلەنوێ دەست دەكات بەبنیاتنانەوە، پێویستە ئێمەش لە درەختەوە فێربین كاتێ شتێك لە دەست دەدەین كە بەرهەمی ماندووبوونمانە، كۆڵ نەدەینو وەڕەس نەبین، چونكە مانای كۆتایی ژیانو تەواوبوونی نییە، بەڵكو دەبێت جارێكی تر دەست پێبكەینەوەو بەرهەمی جوانترو بەسودتر بەدەست بهێنین.

٢- دیارە هەموو درەختێك دەزانێت كە وەرزێكی نوێ دێتە رێی بۆئەوەی سەر لە نوێ دەست بكاتەوە بە گەڵاكردنو بنیاتنانەوە، ئەویش بەهارە ئەو ئومێدو هیوایە وای لێ دەكات بە درێژایی زستانی سەخت هەوڵی كۆكردنەوەی خۆراكو خۆ تۆكمەكردن بدات، خۆی بۆ هەموو سەختیو دژوارییەكان رابگرێتو بە سەریاندا سەربكەوێت، بۆیە ئێمەش دەبێت درەخت ئاسا هەمیشە لە كۆششدا بین هەرچەند رێگا سەختو دژوار بێت بڕوایەكی تەواومان بە ئایندەیەكی بەهاری هەبێت كەنیازمانە بیگەینێ بۆئەوەی دڵ گەرمو پێست قایمو بەگوڕبین لە هەوڵدانەكانماندا.

٣- هیچ درەختێكیش حەز بەوەرینی گەڵاكانی ناكات، بەڵام ئەوە هەررووودەدات، چونكە سروشتی ژیانی خۆیەتیو سروشتی ژیانی ئێمەش وایە، هەرچەندە حەزمان لە هەمووشتێكە، بەڵام ناتوانین هەمووشتەكانمان هەبێت، بۆیە دەبێت هەندێكجار بەشێك لەوانەی كە هەمانە لە دەستیان بدەینو لە خۆبوردوانە وازیان لێ بهێنین لەپێناوی ئەوەی لایەنەكانی تری ژیانمان بەسەركەوتویی بەرێ بكەین.

٤- هەموو دارێكی بێ گەڵاو بێ بەرهەمو بێ سێبەر بێ سوودە، بۆیە لە بڕینەوە بە دوور نابێت، ئێمەی مرۆڤیش بەو چەشنەین كە كەسی بێ بەرهەمو بێ كەڵكمان خۆش ناوێتو گرنگی پێ نادەین، بە پێچەوانەشەوە كەسانی تێكۆشەر جێگەی رێزو شانازینو هەمیشە سەربەرزن هەربۆیە دەبێت ئێمەش وابین.

# هەڵچوونی دەروونی

ئاسۆ سەید لوقمان گەورەدێی

هەموو خەڵـك كاتێكیان هەیە كە تیایدا هەست دەكەن لە ژیانێكی باشدا نینو لە ژێر فشارێكی زۆردان، ئەگەر ئەمە كاریگەرییەكی دیاری لەسـەر باری دەروونـی ئێمە هەبوو پێی دەڵێن هەڵچـوون. هەڵچوون تێكچوونی هاوسەنگییە لە نێوان ئەوەی كە دەمانەوێتو ئـەوەی كە هەسـتو دەروونمـان دەینوێنێ، لەوانەیە كاریگەری خراپی لەسـەر جەسـتە هەبێت: سـەرت بێشـێت، پشـتت ژان بكات، یان هەسـت بە هەناسـە تەنگـی بكەیت لە ڕێـگای هەناسـەی خێـراوە (زێدە هەناسـە بدەی) نەخۆش كەوتن لەوانەیە ئەو ڕێگایە بێـت كە بە هۆیەوە لەشـت لە دەسـت ئەم پاڵەپەسـتۆیە ڕادەكات، كـە نەخۆش بوویت هیچی تر بایـەخ نادەیت. هەروەها لەوانەیە نیشـانەی دەروونیت لـێ دەربكەوێت وەك: هەسـتكردن بـە ماندووبوون یـان لەوانەیە هەسـت بكەیت ڕەتكراویتەوە واتە (پشتگوێ خـراوی)، یـان گۆشـەگیری، لەبەرئەوە هەر خەڵكەو جۆرێكە، بۆیە هەریەكەو بەجۆرێك كاردانـەوەی بۆ هەڵچـوون دەبێت، جیاوازی لەشـی خەڵك نیشانەی جیاواز پەیدا دەكەن، هەندێك خەڵك سەریان دێشێت، هەندێكی تر گەدە یان ماسولكە یان سكیان دێشێت.

خۆچارەسـەری، (خـۆت دەتوانـی چـی بكەیت):

زۆر چاوەڕێ مەكـە، هەڵچوون لەوانەیە ئێمـەش وا لێ بـكات كـە زۆری پێنەچێت نەخۆش بكەوین.

هیچ چارەسـەرێكی سـادە بۆ هەڵچوون نییە، زۆرجار ئاسـان نییە كە شـێوازێك لە ژیانی خۆمـان بگۆڕین، تۆش ناتوانیت خۆت هەمـان شـێوە بگۆڕیـت، بـەڵام ئەوەندەی تەندروسـتیت باشترە لەشو مێشكت باشترە دەتوانـن خۆیـان ڕابێنـن، بۆیە بیـر لەوە بكەرەوە كە هەفتەی دووجار وەرزش بكەیت، بیـر بكەوە كە باشـترە كێشـەكانت لەگەڵ كەسـێكی تر كـە نزیـك بێت لـە خۆتەوە بـاس بكەو شـییان بكەرەوەو چارەسـەریان بۆبـدۆزەرەوە بـە گوێـرەی توانـا، داوای یارمەتییان ڕێنمایی بكە بۆئەوەی بزانیت كە ئایـا دەتوانرێت هەڵچوونەكە كەم بكرێتەوە، بۆ نموونە وەرزشو كاتی خاوبوونەوە لەگەڵ هاورێكانت (ئێستا بەمە دەڵێن: مامەڵەكردن لەگـەڵ هەڵچـوون). هەڵچـوون لەوانەیـە پەیوەنـدی بە پەیوەندییەكـی زەحمەت یان كارێكی زەحمەتەوە هەبێت كە پێویسـتە تۆ زۆر لە گەڵیدا ماندوو بیت گۆڕانێكی بەهێز لە ژیانت لەوانەیە جدی بێت، چونكە هێمنی مێشـك بۆماوەیەكـی درێـژ نرخێكی زۆری هەیـە، دەرمانـی دژە خەمۆكییـەكان وەڵام نینو چارەسـەری گونجاو نین بۆ هەڵچوونی دەروونی، قسـەكردنو گفتوگۆكـردن لەگەڵ خەڵكـی بە تایبەتـی ئەوانەی پێشـتر ئەم بارەیان هەبووە لە وانەیە بە سوود بێت.

بۆ هەندێك كێشە گروپی خۆ یارمەتی دان هەیـە، ڕێ دەدەن خەڵك گرفتەكانیان لەگەڵ خەڵكی تر گفتوگۆ بكەن كە پێشـتر هەمان گرفتیان هەبووەو لێی ڕاهاتوون، نوسینگەی خزمەتگوزاری كۆمەڵایەتـی ناوچەكەت لەم بارەیەوە قسـەت بۆ دەكـەن، خزمەتگوزاری كۆمەڵایەتـی هەن بـۆ ڕەوانەكردنی خەڵكی بـۆ ئەو ئاژانسـانەی كـە ئامادەكـراون بۆ یارمەتیدان بە باشـترین شێوە، هەوڵبدە بە تەنیا نەبیت، زۆر بیر لە شتەكان مەكەرەوە، زۆر بیـر لە ڕابـردوو مەكـەرەوە ئەگەر بۆ پەندلێوەرگرتـن نەبێت، هەوڵبدە ڕاوێژ بكە بۆ كارەكانـت و لەكۆتایدا بەرنامەڕێژی بكە بۆ ژیانتو چیتر كهول مەخۆرەوە.

سەرچاوە:
Treat Yourself to good health.

# ئازاری ویژدان

و/ ئیبراهیم بەهائەدین ئەحمەد

بەرەبەیانی رۆژێکی زستان بوو، باران بە لێزمە دەباری، شەقامەکان چۆڵ بوون، لەو کاتەی یەکێك لە پەرتووکخانە بچووکەکانی شاری (لشیفیلد) دەرگاکانی دەکردەوە، لە پشت مێزێکی بچووکدا لە نزیك دەرگاوە پیرە پیاوێك دانیشتبوو، بە هۆی کۆکە بەردەوامەکەی هەناسەی بە زەحمەت بۆ دەهات، ریشسپی و لاواز بوو، خەریکی رێکخستنی هەندێك کتێب بوو کە تازە بۆی هاتبوو. دوای ئەوەی کتێبەکانی لەسەر رەفەیەکی نزیك خۆی ریزکرد، دیسان کۆکە هێرشی بۆ هێنایەوە، پیرە پیاوەکە هەردوو دەستی دایە بەرسەری خۆیو ئەنیشکەکانی لەسەرمێزەکە دانابوو بۆ ئەوەی کەمێك بحەسێتەوەو هەناسەی بێتەوە بەر، بە دەنگێکی لاواز بانگی کرد: (ساموئیل!)...

ساموئیل لە گۆشەیەکی کتێبخانەکە دانیشتبوو.. کتێبێکی قەبارە گەورەی لەبەردەم خۆی دانابوو.. بە جۆرێك سەری خستبووە ناو کتێبەکە وەك ئەوەی چاوەکانی کەم بینا بن. ساموئیل گەنجێکی هەژدە ساڵان بوو، بەڵام زۆر لەو تەمەنە گەورەتر دیاربوو، باڵابەرزێکی چوارشانەبوو، دەموچاوێکی گۆشتنی نارێکی هەبوو، بە هۆی ئاسەواری نەخۆشی خوریکە کە کاتی خۆی تووشی هاتبوو.

جارێکی تر پیرە پیاوەکە بانگی کرد: (ساموئیل!)

بەڵام بێدەنگی باڵی بەسەر ساموئیل دا هێنابوو، هیچ وەڵامی نەبوو، بە جۆرێك چووبووە ناو قووڵایی خوێندنەوە ئاگای لە دەوروبەری نەمابوو.

پیرە پیاوەکە هەندێك لە کتێبەکانی ئامادەکردو پێچایەوە. دیسان بەهۆی ئەو ماندوو بوونەوە کۆکە هێرشی بۆ هێنایەوە بە جۆرێك هەموو جەستەی لاوازی لەگەڵ دەلەرزی.

هەناسەیەکی وەرگرتەوەو ئەمجارەیان بانگی کردەوە: (ساموئیل!)

بەڵێ باوکە چیت دەوێ؟

باوکی وتی: کوڕی خۆم تۆ دەزانی بەیانی رۆژی بازاڕی کتێبە لە شاری (اوتوکیستر). کتێبخانەکەشمان پێویستی بە رێکخستنەوە هەیە، هەندێ لە کڕیارانمان سەردانمان دەکەن بۆ کڕینی ئەو کتێبانەی کە لێمان چاوەڕوانن بیانهێنین، لەبەرئەوە پێویستە یەکێکمان بچێت بۆ ئەوێ بۆ گۆڕینەوەی هەندێك کتێب بە کتێبی تازە. منیش خۆت دەزانی هەست بە ماندووبوونێکی زۆر دەکەم، ئەو کۆکەیە بێ هێزی کردووم، بۆیە دەترسم ئەو کارەم پێ ئەنجام نەدرێت کوڕەکەم، ئەو بارانە زۆرەو هەوا شێدارە نەخۆشییەکەم ئالۆزتر دەکات!

بەڵێ باوکە.. من نیگەرانم بۆ حاڵی تۆ!

دیسان سەری خستەوە ناو کتێبەکەو بەردەوام بوو لە خوێندنەوە...

باوکی بە سۆزەوە لێی دووبارە کردەوە: کوڕی شیرینم؟.. دەتوانی لە جیاتی من بڕۆی بۆ ئەو کارەو من لە کتێبخانەدا بمێنمەوە؟..

دیسان بێدەنگی باڵی بەسەر ساموئیل دا کێشایەوە، وەك ئەوەی گوێبیستی هیچ نەبووبێت.

پیرەپیاوەکە بەرەو دەرگاکە بە رێکەوتو سەرێکی بە دەرەوەدا گرت، بارانی بە گوڕ بەردەوامە... لەرزەیەك بە جەستەیدا هات، قوپچەکانی پاڵتۆکەی داخستو چاوەڕێ بوو... لە کۆتایی شەقامەکە گالیسکەی سەفەری بینی بەرەو لای دەهات کە دوو ئەسپ رایان دەکێشا، ئاوڕێکی لە کوڕەکەی دایەوەو وتی:

ساموئیل... کوڕی خۆم.. ئەم جارەیان لە جیاتی من ناچی بۆ بازاڕ؟ ..گالیسکەکە هات.. ساموئیل! نازانم ساموئیل گوێبیستی باوکی بوو یان نا! تەنها ئەوەندە دەزانم کە ساموئیل بەردەوام بوو لە خوێندنەوەو سەری لەسەر کتێبەکە بەرز نەکردەوە!

گالیسکەکە گەیشتو لەبەر دەرگای کتێبخانەکەدا وەستا... پیرە پیاوەکە تەکانی دایە خۆیو هەگبەی کتێبەکانی هەڵگرتو سواری گالیسکەکە بوو، کەوتە رێ.

پەنجا ساڵ بەسەر ئەو رووداوەدا تێپەڕی... رۆژی بازاڕی کتێب بوو لە ئۆرکیستر.. رۆژێکی زستان بوو.. باران بەلێزمە دەباری.. هەموو خەڵکی کە هاتبوون بۆکڕینی کتێبو ئاڵوگۆڕکردنی.. رایان دەکرد بەرەو هەیوانی دوکانەکان، یاخود نزیکترین بنمیچو ژێر باڵکۆنەکان.. بۆئەوەی باران جەستەیان تەڕنەکات!

لەو کاتەدا گالیسکەیەکی جوان بەرەو شەقامەکە دەهات کە لە شاری (لیشفیلد )ەوە هاتبوو.

پیرەپیاوێك لێی دابەزی (وادیاربوو لە تەمەنی حەفتاکان بوو). چوارشانەیەکی ریشسپی بوو، دەموچاوی ئاسەواری خوریکەی لەسەر دیاربوو. لە چاوانیدا دڵتەنگییەکی شاراوە دەخوێنرایەوە. هەناسە سواربوو وەك ئەوەی نەخۆشی رەبووی هەبێت...

بە هۆی گۆچانەکەیەوە بە هێواشی بۆ ناو بازاڕەکە کەوتە رێ، وەك ئەوەی هەست بە باران نەکاتو کاری تێنەکات، سەیری ئەو دوکانەی کرد کە کتێبی فرۆشیارانی شارەکانی تری لێ نمایش دەکرا. دوکانەکە کۆن بوو، بەشێکی داڕمابوو.. بەڵام بەشەکەی تری نەخشە جوانکارییەکانی بەسەرەوە مابوو. گەیشتە بەردەم دوکانەکەو بە دەنگێکی بەرز وتی: خۆیەتی... ئێرە ئەو شوێنەیە کە من دەممەوێت... بەڵێ... ئێرە ئەو شوێنەیە باوکم دەهات کتێبەکانی تیادا نمایش دەکرد...

پیرەپیاوەکە لە شوێنی خۆی وەستا لەبەر باران، کڵاوەکەی لەسەری هێنایە خوارەوەو گۆچانەکەی کەوتە ناو ئەو ئاوەڕۆیەی لە بەردەمی ڕەت دەبوو... هەردوو دەستی لەسەر سنگی خۆی دانا.. بە بێدەنگی لە شوێنی خۆی وەستا.. بارانیش بەردەوام بوو لە بارین لەو کاتەی زەنگی کاتژمێرەکە لێی دا، یازدەی پێش نیوەڕۆبوو... دوکاندارەکان لە پشتەوەی جامەکانیان چاویان تێ بریبوو... رێبوارەکان بە سەر سامی سەیریان دەکرد... هەندێکیان گاڵتەیان پێ دەکرد.. لەو کاتەی باران هەموو جەستەی داپۆشیبوو.. ئایا ئاوی باران بوو.. یان فرمێسك بوو بەسەر

دەموچاوی خوریکاویدا دەهاتەخوار؟!

هەندێکیان دەیان وت شێتە! هەندێکیان قسەی ناشیرینیان پێ دەوت.. هەندێکیشیان بە چاوی سۆز سەیریان دەکرد..

بارانەکە بەردەوام بوو بەسەر جەستەیدا دەباری‌و هەموو گیانی تەڕکردبوو.. بەڵام پیرەپیاوەکە وەك پەیکەرێکی بەردین بێ جووڵەو بێدەنگ وەستابوو.

گەنجێك بە پێشیدا تێپەڕی‌و پرسی: ئەو پیرەپیاوە گەمژەیە کێیە؟

یەکێکی تر کە لەو کاتەدا تێپەڕی‌و سەیری پیرەپیاوەکەی کرد.. رووی کردە گەنجەکەو وتی: دەنگت نزم کە! مەڵێ ئەو پیاوە پیرە ناناسم.. ئەگینا خەڵکی بە گەمژەو نەزان ناوت دەبەن! ئەو پیرەپیاوە لە گەورەپیاوانی ئینگلتەرایە.. ئەوە بەڕێز (صاموئیل جونسون)ە! نووسەری شاکاری (راسیلبس)و (ارینی)و (ژیانی شاعیران)و چەندین کتێبی ترە! هەروەها دانەری فەرهەنگی ئینگلیزییە، پیاوماقووڵانی ئینگلتەرا تامەزرۆی پێشوازی کردنی ئەو کەڵەپیاوەن... بۆیە بێگومانم کە بۆ ئەو رەفتارەی وەڵامێکی پێیە!!

هێدی هێدی بارانەکە وەستاو خەڵکی لە دوکان‌و هەیوانەکان بەرەو شەقامەکە بڵاوبوونەوە.... زەنگی کاتژمێرەکە لێی دایەوە، دوازدەی نیوەڕۆبوو.

پیرەپیاوەکە یەك کاتژمێری تەواو لەبەر باران وەستابوو.. بە هێمنی کڵاوەکەی نایەوە سەری‌و گۆچانەکەی هەڵگرتەوەو بە چەند هەنگاوێکی هێمن گەڕایەوە ناو گالیسکەکەی بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە (لیشفیلد)!

هەرکە گەیشتەوە ماڵ.. ئەو ئافرەتەی سەرپەرشتیاری ماڵەکەی دەکرد، پێشوازی لێکردو وتی: لە کوێ بووی دکتۆر جونسون.. بە درێژایی ئەمڕۆ نەهاتیتەوە؟! ئای چیت بەسەر هاتووە؟ هەموو لاشەت ئاوەو گیانت دەلەرزێ؟ چی رووی داوە؟

ئەویش بە هێمنی وتی: خاتوونەکەم.. پەنجا ساڵ لەمەوبەرو لە رۆژێکی وەکو ئەمڕۆدا باوکم داوایەکی لێکردم جێبەجێم نەکرد. ژانی ئەو رەتکردنەوەیە بە درێژایی ساڵانی تەمەنم تاکو ئێستا ئازارم دەدات! وەك ئەوەی لە دۆزەخدا بژیم.. شتێکم نەدۆزییەوە رزگارم بکات لەو ئازارە تەنها ئەو کارە نەبێت، بۆ پاکبوونەوەم لەو گوناهەی بەرامبەر بە باوکم کردوومە! بۆیە سزای خۆمم دا بە وەستانم لەبەرامبەر خەڵك بۆ ماوەی یەك کاتژمێر لەبەر باران‌و سەرما لەبەردەم ئەو دوکانەی باوکم لێی دەوەستا بۆ فرۆشتنی کتێبەکانی.

پیرە پیاوەکە هەردوو دەستی دابووە بەر سەری‌و ئەنیشکەکانی لەسەر مێزەکە گیرکردبوو... هێدی هێدی فرمێسك بە روومەتیدا دەهاتە خوار... لە دەرەوەش باران بەخوڕ دەهاتە خوارو کوچەو کۆڵانەکانی دەشۆردەوە...

سەرچاوە:
السائح الغريب - د. عبدالمنعم مصطفى

و: مودریک عەلی عارف



# پاڕانەوە لە خوا بۆ دەستخستنی حەقیقەت

ئەی خودای بەدیهێنەرم! من ئەمڕۆ داوات لێ دەکەم کە چاوەکانم بکەیتەوەو دڵم فراوان بکەیت، بۆ ئەوەی بتوانم حەقیقەت‌و ڕاستی‌و ڕاستگۆیی لە ژیانمدا ببینم.

پەروەردگارا! یارمەتیم بدە تاوەکو لە بەرامبەر وەسوەسەو ختوورەکانەوە بەهێزو دامەزراو بم.

ئیلاهی! هۆشیاری‌و ئاگاییم پێ ببەخشە، تاوەکو ئەو بیرو باوەڕە درۆینانە بناسم کە وزەو توانای نێگەتیف لە ژیانمدا بڵاو دەکەنەوە.

خوایەگیان! ڕێگەو مۆڵەتم پێ ببەخشە، تاوەکو هەموو ئەو شتانە ببینم کە هەن‌و بوونیان هەیە، نەك تەنها ئەوانەی کە خۆم دەمەوێ بیانبینم.

یاڕەب! ڕێگەو مۆڵەتم پێ ببەخشە، تاوەکو هەموو ئەو شتانەی کە هەن بیانبیستم، نەك تەنها ئەوانەی کە خۆم دەمەوێ بیانبیستم.

پەروەردگارا! یارمەتیم بدە تاوەکو هۆشیاری‌و زانیاریم زیاد بکەم، بۆ ئەوەی لە هەموو ئەو شتانەدا کە بە گوێ‌و چاوەکانم‌و هەموو بوونم هەستیان پێ دەکەم، زیاتر گەورەییت بناسم.

ئیلاهی! ڕێگەو مۆڵەتم پێ ببەخشە، تاوەکو بۆ هەر کوێ دەڕۆم‌و لە هەر شتێکدا کە دەیبینم، بە چاوە پڕ لە عیشقەکانم تەنها شوێنەواری قودرەتی تۆ ببینێت.

خوایەگیان! یارمەتیم بدە تاوەکو لە یەك بەیەکی خانەکانی جەستەم‌و لە هەموو هەست‌و بیرو بۆچونەکانمداو لە هەموو ئەو مرۆڤانەی کە سەردانیان دەکەم، دەسەڵاتی تۆ ببینم.

یاڕەب! ڕێگەو مۆڵەتم پێ ببەخشە، تاوەکو لە ژێر باران‌و لە نێو گوڵەکان‌و لە ناو ئاوی پاك‌و زوڵاڵ‌و پاراوو لە ناو ئاگرو لە نێو پەپولەکاندا، دەسەڵاتی تۆ ببینم.

ئیلاهی! داوات لێ دەکەم هەر کارێك کە ئەنجامی دەدەم جوانی‌و قەشەنگی لە مندا بەدی بهێنێت، یارمەتیم بدە تاوەکو هەست بەو جوانی‌و جەماڵ‌و کەماڵە بکەم کە تۆ لە هەموو دروستکراوەکانتدا داتناوەو بەدیتهێناوە.

خوایەگیان! لە ئەمڕۆوە دەمەوێ سودو بەهرە لە وزەو توانای عیشقم ببەم، بۆ ئەوەی شاکارێکی گەورە لە ژیانمدا بەدی بهێنم، ئەمەش بە یارمەتی تۆ، بەڵێ تەنها بە یارمەتی تۆ.




هەموویان وتیان بۆچی؟

وتم: بۆچی نا؟ مەگەر مینۆ مرۆڤ نییە؟

باوکم ئەسڵەن ئەم قسەیەی پێ خۆش نەبوو، دایکم لە ناخی دڵەوە ڕازی بوو، بەڵام چاوی لە دەمی باوکم بوو، بە هەرحاڵ کاتی ئەوە هاتبوو کە کەسێك لەم ماڵەدا بێ پێچوپەنا سەبارەت بە (مینۆ) قسە بکات، ساڵەهای ساڵە کەس نەی وێراوە بڵێت: (مینۆ) کێشەیەکی هەیە، دایکیشم هەمیشە بە دەوروخولیدا دەهات تا هەست بە کەمی خۆی نەکات، دوایی کە گەورەتربوو لە حەوت کوندا دەیانشاردەوە تا کەس نەیبینێتو چپەچپی خەڵك بەرز نەبێتەوە، وایان دەزانی بوونی منداڵێکی کەم ئەقڵ تاوانێکی گەورەیە. هەرچەند هەوڵم دەدا (مینۆ) زۆر سروشتی تر مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، بەڵام سوودی نەبوو، کاتێك کە منداڵ بوو دەمبردە پارك، دایکم دەستی بە هاوار هاوارو دەنگەدەنگ دەکردو دەیگوت: ئاخر ئەم منداڵە چوزانێ پارك چییە! جگە لەوەی کە هەمووان سەیری ئەو دەکەن.

بەڵام من دەمبینی کە (مینۆ) چەند شادو خۆشحاڵ دەبوو، لەگەڵ منداڵانی تر یاری دەکردو تەنانەت هاوڕێشی پەیدا دەکرد، بەڵام باوکمو دایکم باوەڕیان نەدەکرد.

کەم ئەقڵی (مینۆ) ئەوەندەش زۆر نەبوو کە نەتوانێت کارە تایبەتییەکانی ئەنجام بدات، دەرۆیشتە قوتابخانەو تەنانەت خوێندنو نووسینیش فێرببوو، تەنها کەمێك هەڵیتو پەڵیتی دەگوت، هەندێ جاریش لە هەموومان ئاقڵتربوو، ئەو قسانەی کە گەورەکانیش نەیان دەوێرا بیکەن ئەو زۆر ڕاستگۆیانە دەیکرد.

بە کورتی غەڵبەغەڵبی سەرەکی کاتێك دەستی پێکرد کە باسی شوکردنی (مینۆ)م کرد، باوکم بە تووڕەییەوە وتی:

دەتەوێ ئابڕومان بەریت؟ (مینۆ) لەسەر سەروسەرچاوی ئێمەیە، تا زیندووبم خۆم چاودێری دەکەم، دوای مردنیشم هەموو میراتەکەم دەدەم بە ئەو.

ئەوان بێئاگا بوون لەوەی کە ئەم (مینۆ) خۆشەویستەی ئەوان عاشق بووە! ئەو لەو دامەزراوەیەدا کە فێری کاری دەستیان دەکردن لەگەڵ فەرهاد ئاشنا ببوو، هەموو ڕۆژێك باسی فەرهادی بۆ دەکردم، لەوەی کە جوانکیلەیە، لەوەی کە خۆشی دەوێ و... ئەوەندە ڕاستگۆیانە قسەی دڵی خۆی دەکرد دڵم زۆر بۆی دەسووتا، یەك دوو جاریش فەرهادم بینی، کوڕێکی سادەو هاوشێوەی (مینۆ)...

ڕۆژێکیان دایکی فەرهادم لە بەردەم دامەزراوەکەدا بینیو تکای لێکردم مۆڵەت بدەین ئەم دوو بوونەوەرە پاكو سادەیە لەگەڵ یەکتر زەماوەند بکەن، دایکی فەرهاد بەڵێنی دا چاودێری هەردووکیان بکات، بەڵام ئامان لە دەستی باوکم... وای دەزانی کچەکەی ناتەواوەو ئەسڵەن مافی شوکردنی نییە بیرکردنەوەکانی هەڵەبوو، بەڵام لەناکاو ڕووداوێکی سەیر ڕوویدا!

کوڕێکی دەوڵەمەندو خوێندەوار هاتە خوازبێنی من، بڕیاردرا (مینۆ) بشارنەوە تا کەس نەیبینێت، بەڵام بێ پێچو پەنا هەموو شتێکم هەر لە یەکەم دانیشتندا ڕوون کردەوەو ڕاستگۆیانە وتم:

من خوشکێکی کەم ئەقڵم هەیە... دەڵێن لەوانەیە بۆماوەی ئەو نەخۆشیەش لە مندا بوونی هەبێت...

دایكو باوکم خەریکبوو لە هۆش خۆیان بچن... باوەڕیان نەدەکرد کە من ئەوەندە بە ئاسانی شەق لە بەختی خۆم هەڵدەم، بەڵام من ئەم کارەم ئەنجامدا.

دوای چەند ڕۆژێك دایکی ئەو کوڕە تەلەفۆنی کردو وتی:

ڕاستگۆیی خێزانەکەتانم زۆر بە لاوە جوان بوو، کوڕەکەم سوورە لەسەر ئەوەی کە باشتر کچەکەتان بناسێت.

دایکم خەریکبوو لە خۆشیاندا باڵی دەگرت، باوکیشم زۆر خۆشحاڵ بوو، ڕووم تێکردنو پێم وتن:

کەواتە ڕاستگۆیی ئەوەندە بەنرخە کە ئەوان ئامادەن بوکێکیان هەبێت کە...

باوکم هیچی نەگوت، خۆم تەلەفۆنم کرد بۆ دایکی فەرهادو ڕۆژو کاتی خوازبێنییەکەمان دیاری کرد، مەرجی زەماوەندی من ئەوەبوو کە سەرەتا (مینۆ) شوو بکات.

دایکە ئەقڵ سادەکەم دەیگوت: ئاخر ئەم منداڵە کەم ئەقڵە، چوزانێ زەماوەندو ژیانی هاوبەش یانی چی!

لەداخا خەریکبوو دەخنکام، کاتێك چاوە درەوشاوەکانی (مینۆ)م دەبینیو دەمزانی ئەویش وەکو هەمووان حەزی لە هاوسەرو هاوبەشو هاوڕێ هەیە، بەڵام کەس بە جدی ئەمەی وەرنەدەگرت، خێزانی فەرهاد خۆشبەختانە تێگەیشتووانەتر بیریان لە کێشەکانی منداڵەکەیان دەکردەوەو هەموو پێداویستییەکانیان ئامادە دەکرد.

سەعیدی داواکارم لە هەموو ئەم ڕووداوانەدا ئامادەبوو، پاشان وتی: هەر ئەم بۆچوونو ڕەفتارانەی تۆ وای لێکردم کە هۆگرت بم، هەستی دەکرد کە من نرخ بۆ مرۆڤەکان دادەنێم، ئەمەش گەورەترین هەستی هەموو مرۆڤێکە.

کارەکانی هەردوولا جێبەجێ کرا، (مینۆ) و (فەرهاد) لە ژێرزەمینی ماڵی باوکی فەرهاددا ژیانی خۆیانیان دەست پێکرد، دایکی فەرهاد وردە وردە (مینۆ)ی فێری کاروباری ماڵ کرد، فەرهادیشی فێر کرد کە دەبێت شت بۆ ماڵەوە بکڕێتو حسابو کیتابی پارەکانیان بکات. من و سەعیدیش ژیانێکی شیرینو خۆشمان دەست پێکرد... ئێستا دە ساڵ بەسەر ئەمەدا تێپەڕیووە، باوەڕ ناکەن ئەگەر بڵێم ڕۆژانێك هەبوو من منداڵەکەم دەدایە دەست فەرهادو (مینۆ)و خۆشم دەچووم بەلای کارەکانمەوە، دەمزانی بە تەواوی هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەنو...

خۆزگە هەمووان بیان توانیایە بە سروشتی تر لەگەڵ منداڵانی کەم ئەقڵ ڕەفتاربکەنو مۆڵەتی ژیانی سروشتییان پێ بدەن... خۆزگە...

س/ گۆڤاری روزهای زندگی/ژ۰۳۱۲۰

# کێ دەوڵەمەندەو کێ هەژار؟

ئا/ سایە فارس

رۆژێك پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند بە هاوڕێیەتی کوڕەکەی گەشتێك بۆ شارێکی هەژارنشین ئەنجام دەدات، تا کوڕەکەی بە چاوی خۆی حاڵو گوزەرانی هەژاران ببینێتو بزانێت بە چ شێوەیەك ژیانی رۆژانەیان بەسەر دەبەنو چۆن دەژین!

بۆ ئەم مەبەستە چەند رۆژێك لە ماڵی خێزانێکی هەژاردا بەسەر دەبەن··· پاش کۆتایی گەشتەکەیانو گەڕانەوەیان باوکەکە لە کوڕەکەی پرسی کوڕی خۆم گەشتەکەت بەلاوە چۆن بوو؟

ئەویش دەڵێت: بابە گیان گەشتێکی زۆر نایاب بوو!!

باوکەکە وتی: ئایا بینیت هەژاران بە چ شێوازێك دەژین؟!

کوڕەکە لە وەڵامدا وتی: بەڵێ بابە گیان···

باوکی منداڵەکە بەردەوام بوو لە گفتوگۆکردنو پرسیارکردن لە کوڕەکەی: کەواتە پێم بڵێ لەم گەشتەدا چی فێربوویت؟

لەوەڵامدا وتی: بینیم ئێمە سەگێکمان هەیەو ئەوانیش چوار سەگ··!!

لە ناوەڕاستی باخچەکەماندا حەوزێکی بچووکی ئاومان هەیە، بەلاّم ئەوان جۆگەیەکیان هەیە کۆتایی نایەت!!

ئێمە چەند فانۆسێکمان بۆ رووناك کردنەوەی باخچەکەمان هەیە، ئەوانیش هەزاران ئەستێرەی پرشنگدار ئاسمانی باخچەکەیان رووناك دەکاتەوە··

ماڵەکەمان تابەردەم باخچەکەیەو کۆتایی پێ دێت··· بەلاّم ئەوان ئاسۆیەکی بەرفراوانیان هەیەو کێلگەکانیش تێ دەپەڕێنێ!!

ئێمە چەند خزمەتکارێکمان هەیە خزمەتمان دەکەن، ئەوانیش هەرئەندامێکی خێزانەکەیان لەنێوان خۆیاندا خزمەتی یەکتری دەکەن··

ئێمە بۆ دەستکەوتنی پێویستیو خواردنەکانمان ناچاردەبین بیانکڕین، ئەوانیش ئەوەی کە خۆیان دەیچێنن دەیخۆنو نایکڕن···

ئێمە چەند دیوارێکی بەرزمان هەیە تا بمانپارێزێت··· ئەوان چەند هاوڕێیەکی دڵسۆزیان هەیە پارێزگارییان لێ دەکەن!!

باوکی منداڵەکە گوێی لە کوڕەکەی دەگرتو بێ دەنگ ببوو···

لەو کاتەدا کوڕەکە وتی: بابە گیان زۆر سوپاست دەکەم لەبەرئەوەی تێت گەیاندم کە ئێمە چەندە هەژارین!!

زۆرێك لە ئێمە بیر لەوە ناکەینەوە کە هەمانە، بەڵکو تەنها تامەزرۆی ئەو شتانەین کە نیمانەو وای لێکردووین ئەوەشی کە هەمانە نەیبینینو خۆشی لێ نەبینین، بۆ نموونە ئێمە خاوەنی لەشساغیو تەندروستییەکی باشینو هیچ ئازارێکمان نییە، بەلاّم ئەگەر تەنها یەکێك لە ئەندامەکان ئازارێکی هەبێت ساغی ئەندامەکانی ترمان بیردەچێتەوەو سکالاّی ئازاری ئەو ئەندامە دەکەین···

راستە ئێمەی ئادەمیزاد هەموو وەك یەك خاوەنی شتەکان نین، لەوانەیە کەمتر یان زیاترمان هەبێت لەچاو ئەوی تردا، بەلاّم بە دڵنیاییەوە خوای گەورە خۆی باش دەزانێت تا چ ئاستێك بۆ ئێمە گونجاوە، هەرچەندو هەرچۆنێك بێت با قەدری بزانینو بە چاوی کەم سەیری نەکەین چونکە:

ئەگەر خوای گەورە ناڕەحەتیو ناخۆشیو کێشەی هێنایە رێت، ئەوە بزانە خۆشی دەوێیتو دەیەوێت دوعاو پاڕانەوەکانت ببیستێت···

ئەگەر خوای گەورە کەمی پێ بەخشیت، ئەوە بزانە کە خۆشی دەوێیت لەبەرئەوەی لە رۆژی دواییدا زیاترت بداتێ···

ئەگەر خوای گەورە رازی بوونی پێ بەخشیت، ئەوە بزانە خۆشی دەوێیت، چونکە جوانترین نیعمەتی پێ بەخشیویت···

ئەگەر خوای گەورە ئارامی پێبەخشیت، ئەوە خوای گەورە خۆشی دەوێیتو لە براوەکانیت···

ئەگەر خوای گەورە دڵسۆزی پێ بەخشیت، ئەوە بزانە خۆشی دەوێیت، کەواتە دڵسۆزبە بۆی···

ئەگەر خوای گەورە خەمو خەفەتی پێ بەخشیت، ئەوە بزانە خۆشی دەوێیت، چونکە باوەڕت تاقی دەکاتەوە بۆ ئەوەی سوپاسو ستایشی بکەیت···

ئەگەر خوای گەورە ماڵو سامانی پێ بەخشیت، ئەوە بزانە خۆشی دەوێیت، یارمەتی هەژارانی پێ بدە···

ئەگەر خوای گەورە هەژاریی پێ بەخشیت، ئەوە بزانە خۆشی دەوێیتو ئەوەی کە لە ماڵو سامان بەنرخترە پێی بەخشیویت····

ئەگەر خوای گەورە زمانو دڵی پێ بەخشیت، ئەوە بزانە خۆشی دەوێیت کەواتە لە خێرو دڵسۆزیدا بەکاریان بهێنە···

ئەگەر خوای گەورە نوێژو رۆژوو قورئانو شەونوێژی پێ بەخشیت، ئەوە بزانە خوای گەورە خۆشی دەوێیت کەمتەرخەم مەبەو کاریان پێ بکە···

ئەگەر خوای گەورە هیدایەتی پێ بەخشیت، ئەوە بزانە خۆشی دەوێیت···· چۆن خۆشت ناوێ؟؟

خوای گەورە زۆری پێ بەخشیویت··· ئەی بۆ خۆشەویستی خۆتی پێ نابەخشی؟؟

# تاڵییەكانی جودایی و شیرینییەكانی دوای ئاشتبوونەوە

ژیان محەمەد رەئوف

میناو لیزان دووهاوڕێ بوون وەك نەورەس‌و كوكوختی‌و تیشكی پڕجوانی خۆر بوون‌و سڵاوی بەیانیان‌و ئێوارانی ئەوان ئاوازێكی تەواو جیاوازبوو، كاتێك سڵاویان لە یەكدی دەكرد ئاوازو سەمفۆنیاكەیان لە جاری پێشووتر نەدەچوو.

كاتێك تیشكی جوانی كریستاڵی خۆر بەرز دەبووەوە بە ئاسمانی شاردا بڵاو دەبووەوە، زوو لە خەو رادەبوون بۆ خۆئامادە كردن بۆ سەركار، كێبڕكێیان دەكرد بۆئەوەی زوو بگەنە شوێنی كار، لەوێ چاوەڕوانی گەیشتنی یەكتر بكەن بە جوانترین وشەی ئەو ڕۆژە سڵاوی نێوناخی لەیەك بكەن، هەردوو هاوڕێ لە نێو كارمەندانی كارخانە زۆر خۆشەویست بوون، ڕێزو بەهای زۆریان هەبوو، كاتێك كە ناخۆشییەك یان گرفتێكیان هەبوایە هانایان بۆ یەكتری دەبرد، بۆئەوەی هەرچی زووتر بە هەردوولا چارە سەریان بكەن، لە ڕۆژە خۆشییەكاندا لەگەڵ یەكدی دەبوون‌و هێندەی دیكە دڵ خۆش دەبوون و لێوەكانیان زیاتر بە خەندەوە بوو. بەڵام بە داخەوە رۆژە خۆشییەكانی هەردوو هاوڕێ زۆری نەخایاند بە هۆی كێشەیەك كە لیزان دروستی كردبوو خەریكبوو رۆژە جوان‌و خۆشییەكانیان وەك بایەكی پڕلە تۆزوخۆڵ هەڵكاتو بڕوات! ناخۆشییەكانی هەردوولا هێندە بە نارەحەتی‌و دوور لە هاوڕێیەتییەوە دەستی پێكرد، بە تایبەت مینای توشی شۆك‌و دڵە ڕاوكێ كردبوو، چونكە میناو لیزان نەیان دەزانی چەندە تاڵە جیابوونەوەی نێوانیان، بەو جۆرە دەبێتە چ ناخۆشییەك بۆ هەردوولا.

من هەستم بە دڵتەنگی مینا دەكرد، بۆیە بۆلای مینای دڵشكاو ڕۆیشتم، مینا لە بەلەكۆنەكە دانیشتبوو، سەیری ئەو گوڵە مینایانەی دەكرد كە لە نێو ئینجانەكانی ئەوێدا دانرابوو، وتم مینا تۆ هیچ كات سەیری ئەم گوڵانەت بەو وردییە نەكردووە بۆ وائێستا چاویان لێدەكەیت‌و دەڵێیت دڵت شتێكی تێدایەو لێم دەشاریتەوە؟

مینا سەیرێكی گوڵەكانی كردو سەیرێكی منی كردو گوتی: دادە من شایەنی ئەوە نیم كە ناوم مینا بێت، چونكە من لە میناكان دەڕوانم تەواو سەرسامیان كردوم، میناكان هەوڵی ئەوە دەدەن كە كەسانی دەوروبەر زۆر دڵخۆشبكەن خەمزەونازی ئەوان ئەوكەسانە دڵخوش دەكەن، میناكان كە سەیریان دەكەی ئارامی‌و دڵخۆشیت بۆ دەهێنن ئەوان نارەحەتییان بۆكەس پێ نییە ئەوان خەمەكان لە دڵ دەردەكەن.

وتم: مینا بۆچی ناتەوێت ئەوە بڵێیت كە لە دڵتایە ئەوە بڵێیت كە نارەحەتی كردووی؟ میناگیان بەڵێن دەدەم یارمەتییەكی باشت بدەم خوشكێ.

مینا بە دەنگێكی زۆر لاوازەوە كە پڕبوون لە ئازار گوتی: دڵی پڕ لە حەسرەتم چی لێبكەم؟

دادە: ئەو دڵەم چۆن رازی بكەم؟چۆن بڵێم لیزان بە ئێمە ڕازی نییە؟

مینا درێژەی بە قسەكانی داو گوتی: دادە لەوانەیە من نەتوانم لەگەڵ لیزان هاوڕێیەتی بكەم، چونكە من كەسێكم تاڕادەیەك زوو هەڵدەچم، ناتوانم هەندێك شت هەیە زوو قبوڵی بكەم، لیزان پێم دەڵێت تۆ كەسێكی ڕق ئەستووری، ئەم وشەیەی چەندجارێ بۆ دووبارە كردوومەتەوە، لەوانەیە لیزان بە هۆی ئەم رەفتارانەی منەوە نەتوانێت هاوڕێیەتی من بكات.

مینا كەمێك راوەستا بۆئەوەی ئەو فرمێسكانەی كە دەیوست بیرێژێت ڕایان گرێت، تا هەست نەكەم كە چەندە لەگەڵ لیزان هۆگری یەكترن، پاش كەمێك مینا وتی دادە لیزانیش هەندێك شتی هەیە، كەسێكە تەنها لە كارەكانی خۆی ڕازییە هیچ كات داوای یارمەتی لە هیچ كەسێك ناكات، من حەزدەكەم یارمەتی ئەو بدەم، چونكە لیزان زۆر سەرقاڵ دەبێت بە كارەكەیەوە.

ئەوەندەی منیش لیزان دەناسم ئێستا دڵی بۆ من زۆر پەرێشان دەبێت، بیر لەم كارەی باش دەكاتەوە، چونكە لیزان كەسێكە زۆر لە قسەكانیدا وردەو بە باشی بیریان لێدەكاتەوە، مانای وشەكان زۆر بە وریاییەوە لەیەك دەداتەوە، دوای ئەوە پەنجەی پەشیمانی دەگەزێ ئاخر نازانم ئێستا كاتی ئەوە هاتووە كە ئێمە كەوتوینەتە بەر لوتفی خوداوەند بۆ هاوڕێیەتی بۆچی بە جێی هێشتم‌و ڕۆیشت، من بە بێ لیزان نامەوێت بژیم! لیزان هەمیشە بۆ من وەك چرایە.

كاتێك مینا ئەم قسانەی كرد ئیدی ئەسرینی چاوەكانیان ئارامیان لەبەر براو هۆن هۆن دەهاتنە خوارەوە.

كاتێك مینام بەوجۆرە بینی، چاوەكانی پڕبوون لە ماتەم ناو جەرگم ئاگری پڕ لە خۆشەویستی لێبەرز بۆوە، كە بڵێسەی ئاگرەكە هێندە زۆر بوو لە نێو ناخم مینا هەستی پێكرد، وتی: دادە نا مەوێت ئەوەندە ئازار بكێشیت تەنها بۆ خۆم ئەم ئازارە بەسە.

وتم: مینا من دەمەوێت لەگەڵ لیزان قسە بكەم، بەڵام تۆ هەموو شتێك بۆ من بگێڕەوە بزانم چۆن بووە؟

مینا بە ئاهێكی هەڵقووڵاو لە دڵتەنگی‌و بە چاوێكی پڕ لە فرمێسك وتی: دادە ئەم نیوەڕۆیە كاتێك تەواو بووین لە نانخواردن هەركارمەندەو بەرەو ژوورەكەی كەوتە رێ، ماوەیەكی زۆر كەمی خایاند لیزان نامەیەكی بۆ ناردم گوتی دەمەوێت لە هاوڕێیەتیت جیا بمەوە! دادە گیان لیزان نامەكەی چەند وشەیەك بووە، بەڵام زۆر تاڵ بوو، من وام زانی لیزان بە هەڵە نامەكەی

بۆ ناردووم بۆیە بە لیزانم گوت نامەکەت بە هەڵە هاتووە، بەڵام لیزان بە دڵێکی کەمێك تەنگو بە خۆشییەکی شاراوە لە ناخی گوتی نا مینا نامەوێت لەگەڵت هاورێ بم، رەنگە نەتوانم هاورێی رێگای هەردووکمان بم کە رێگای هەردووکمان نادیارە.

بەڵام وانییە من دەزانم لیزان دەتوانێت تا دواهەناسە رێگای هاورێیەتی بەرنەداتو لەگەڵم یەك گیان بێت، دەزانم لیزان بەهۆی ئەوەی کە لە کارەکانی خۆی رازییەو لە خۆشی زۆر رازییە بۆیە ئەم گرفتەی کە هەردووکمانی خستۆتە نێو گێژاوەوە بە هۆی ئەوەوەیە، لیزان بە چەند ساڵێکی کەم لە من گەورە ترە، ئەو وابیر دەکاتەوە کە ئەو پێویستی بە من نییە من پێویستم بە ئەو هەیە، ئەویش رێزی هاورێیەتی بەو جۆرە گرت.

دادە: من نازانم یانی من شیاوی ئەوەنیم کە هاورێی لیزان بم؟ یا لیزان کارتێکەرێکی دەرەکی بەسەریدا زاڵە کە نایەڵێت ئێمە هاورێی یەکتر بین، بەڵام دڵی من هێندە نارەحەتە دەڵێی کێوێك کە چەندە بڵندو قورسە بەسەر دڵمەوەیە، لیزان بۆ من وەك مەشخەڵێك بوو بۆ رێگای تاریکیم، هەمیشە لە بیری ئەوەدابوو رێگایەکم بۆ رووناك بکاتەوە، هەمیشە هەوڵی دەدا کە لێوە کانم خەندەیان لێنەبڕێت، هەمیشە دەیگوت بە زەردەخەنەوە رووخسارت گەشترو جوانتر دەبێت، بەڵام ئێستا هەر لیزان خۆیەتی کە نارەحەتم دەکاتو خەندەی لێوم دەتۆرێنێت، بەڵام دادە دەنگێك لە نێو ناخم دەڵێت، مینا لیزان دەیەوێت تاقیت بکاتەوەو بزانێ تۆی هەرخۆشت دەوێت یان تۆ هاورێکەت بە جێ دەهێڵیت؟

نازانم لیزان لەبەر چ هۆکارێکیان من بە جێ دەهێڵێت؟

مینا هەرلەم قسانەی دەکردوو خەریکی تەلەفۆنەکەی نێو دەستی بوو، وەك بڵێی چاوەڕوانی نامەیەك یان زەنگێکی دڵ خۆشکەر لە لای لیزانەوە بۆ بێت، من بە بەردەوامی چاودێری مینام دەکرد، تا دەهات مینا نارەحەتیو بێ ئارامی پێوە دیاربوو، بۆیە داوام لە مینا کردو گوتم: مینا گیان بابڕۆینە دەرەوە هەوا زۆر خۆشە ماوەیەکە لە دەرەوە بە یەکەوە نانمان نەخواردووە، مینا رازی بوو، ئێمە لەگەڵ خوشکەکانی دیکەمان بۆ دەرەوە رۆیشتینو زۆر کەیف خۆش بووینو خەریکی سوعبەتو پێکەنینو گاڵتە کردن بووین، مینا بە لێو پێدەکەنیو بە دڵ پەنگی دەخواردەوەو لە تووڕەییو خەفەت بۆ هاورێکەی، کاتێك گەڕاینەوە گوتم: مینا من دێم لەگەڵ لیزان قسە دەکەم مینا گوتی نا نامەوێت، لیزان با نەزانێت کەس زانیویەتی بۆئەوەی نارەحەت نەبێت، بۆ خۆم چارەی دەکەم پێی دەڵێم لیزان ئەوەی منی دەوێت منیش بە دڵ ئەوم دەوێت ئەوەی منی ناوێت منیش ئەوم ناوێت، هاورێیەتی جوانترین وشەیە دوای خێزان.

بۆ بەیانی مینا بەرەو کارخانە وەڕێ کەوت، من ئەو رۆژە لە چاوەڕوانی ئەودا بووم، بەڵام ئەو رۆژە کاتژمێری ماڵەوە زۆر تەممەڵ بوو زۆر بە سستی کاری دەکر، کاتی گەڕانەوەی مینا هەر نە دەهات من چەند جارێك چوومە چێشتخانەو لە دایکمم دەپرسیی مینا نەگەڕایەوە؟

دایکم دەیگوت: تۆ تا ئێستا کەی ئەوەندە لە بیری مینادا بووی؟ وا ئێستا ئەوەندە لێی دەپرسی؟ وتم هیچ کارم پێی هەبوو، من بەرەو ژوورەکەی خۆم وەڕێ کەوتم، دوای ماوەیەکی کەم مینا دەرگای ژوورەکەمی بە ئەسپایی کردەوە، گوتی دادە لێرەی؟ کاتێك سەیری رووخساری مینام کرد، وەك پێشتر نەبوو مینا زیاتر رووگەشاوە تربوو، لێوەکانی زیاتر خەندەی پێوە دیاربوو، رووی مینا هێندە گەش بوو کە لە گوڵەبەڕۆژە دەچوو چۆن بە دوای رۆژدا دەسوڕێتەوە رەنگی جوانترو درەوشاوەتر دەبێت، وتم مینا بڵێ چی بوو؟

مینا چاوەکانی لێکناو نیگای لە من کردو چاوەکانی هەڵهێنا کە تیشکی چاوەکانی وەك تریفەی مانگەشەو وابوو، بەپێچەوانەی رۆژی پێشو بوو، چونکە رۆژی پێشتر چاوەکانی لە چاوی کەسێکی دەردەدارو بە ساڵاچوو دەچوو، بە دەم هەناسەیەکی پڕلە دڵخۆشییەوە گوتی: دادە ئەم بە یانییە کە گەیشتمە کارخانە، لیزان هات بۆ لامو گوتی: مینا داوای لێبوردن دەکەم!

من توشی سەرسوڕمان بووم، چونکە لیزان لەو جۆرەکەسانەبوو کە زۆر بە کەمی دانی بە هەڵەی خۆیدا دەناو داوای لێبوردنی دەکرد، من لە سەرەتاوە نەمدەویست داوای لێبوردنەکەی قبوڵ بکەم، بەڵام ئەو داوای لێبوردنی کرد منیش گوتم: لیزان بوراویت، هەرکەسێك ئەوەندە لە کارکردن لەگەڵ یەکدا بێت توشی ئەم جۆرە کێشانەش دەبێت، بەڵام هەندێك کەس ئاشت دەبنەوە، زۆر لە جاران باشتر بەڵێنی دووبارە هاورێیەتیو یەك خێزانی دەدەن، بەڵام هەندێك کەسی تر دڵی پڕ لە خەمیان واز لێ دێنن، هاورێکانیان فەرامۆش دەکەن.

گوتم: لیزان گیان هەموکەسێکیش بە لێبوردەییەوە جوانە.

لیزان وتی: مینا باوەڕبکە من زۆر بۆ تۆ نارەحەت بووم، چونکە هەستم کرد زۆر دڵە پاکەکەتم بریندار کردووە، بۆیە زۆر داوای لێبوردن دەکەم، بەڵام من هێشتا لە تۆ بە باشیش تێنگەیشتووم.

من سەیری لیزانم کردووە ئەوەی کە بە سەرمدا هاتو ئەوەی کە لە نێوناخم بەخۆمم دەگوت بە لیزانم گوتەوە تۆم بە رووناکی رێی خۆم زانیوە، تۆ بۆ من زۆر باشی، چونکە لە من زیاتر لە دنیا شارەزاتری، چونکە تەمەنت لە من زیاترەو لە پێش من لە کارخانە کارت کردووە، بۆیە زۆرم خۆشەویستی بۆتۆ دەربڕی، بەڵام بەو ئەندازەیەی من تۆم خۆش ویستو رێزم گرتیت تۆ نەت دەزانی.

لیزان ئاهی هەڵدەکێشاو گوێی بۆ قسەکانم راگرتبوو.

لیزان وتی: مینا من نەمزانیوە تۆ ئەوەندە منت خۆش دەوێت؟ ئەوەندە من بۆ تۆ بە بەهام، داوای لێبوردن دەکەم من کاری خۆمم زۆر پێ باش بوو، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی من لە خۆم رازیم.

گوتم بەهەرحاڵ ئەوەی روویدا تێپەڕی، بەڵام ئێستا منو تۆ هاورێکەی جاران بین یان زیاتر پەرەی پێبدەین زیاتر پەیمانی خۆشەویستیو هاورێیەتیو یەك خێزانی بدەین.

لیزان رووخساری بە تەواوی گەش بوویەوە، چاوەکانی هەندێك شەرمی پێوە دیاربوو نەیدەویست چاوەکانی زۆر بکاتەوە، دادە منو لیزان ئیدی وەك جاران نین هەرشتێك لیزان بیڵێت، من بە لیزانی بڵێم ئەگەر جێگای قبوڵ بێت دەیکەین، دەبینە چرای رێگای یەکدی، هەر جۆرە رەفتارێك بکەین کە جۆریکی دیکە بێت لەگەڵ کارمەندان یان کەسانی تر یەکتر ئاگاداربکەینەوە، لە ژێر سایەی هاورێیەتیدا یەك خێزان بینو لە ناوخۆشیو تاڵەکاندا بەشداری خەمی یەکتر بکەین.

دادە ئێستا وادەزانم لە جیهانێکی زۆر جیاوازدام، دوور لە ناخۆشی، کەسێك هەیە لە دەرەوەی ماڵەوە کاتێك کە هەڵەم کرد نەیەڵێت بەسەرمدا تێپەڕێتو پێم دەڵێت: مینا گیان هەڵەت کردووە لەو رەفتارە یان لەو کارە، وا دەزانم لەگەڵ لیزان بووینەتە دوو ئەستێرە لە ئاسمانی بێ کۆتادا.

دادە ئەمە چیرۆکی ئێمە بوو کە لە ماوە ٤٨ کاتژمێردا بەسەرماندا هات.

دەستم بە رووخسارە پڕ لە نازەکەی مینادا هێناو هیوای ژیانی پڕ لە خۆشیو خۆشەویستیم بۆخواست لەگەڵ لیزان دواین ناخۆشیان بێتو دوو هاورێی یەك گیان بن.

لەورۆژەوە میناو لیزان دووهاورێ بوون کە لێم دەڕوانین ئاواتم دەخواست منیش هاورێیەکی لەو جۆرەم هەبێت، منیش بەش بە حاڵی خۆم هاورێم هەبوو، بەڵام وەك میناو لیزان نەبووین تا بتوانم رازو نیازەکانمی بۆ باس بکەم، گرێ کوێرەکانی نێودڵمی پێ بڵێمو ئەویش بە ئەسپایی بیان کاتەوە لە نێو بیابانی وشکی بێ ئاودا دەربازم بکات، مینا لەو رۆژەوە زیاتر میهرەبانی پێوە دیاربوو، ئەو رەفتارانەی کە هەی بوو لە خۆیدا کاڵی کردبووەوە، ئەوەی کە کەمێك زوو توڕەدەبێتو رق ئەستورە، مینا باسی لیزانی دەکرد کە چەندە گۆڕاوەو ئێستا لە هەڵەکانی زۆر پەشیمان دەبێتەوەو داوای لێبوردن دەکات، کێشەو خەمەکانی بۆ میناو میناش بۆ ئەو باسی دەکەنو ناخیان ئارام دەکەنەوە.

هەردووکیان هیوای خۆشیو خۆشەویستیو بە لێنی وەفاداری بۆ خۆیانو هاورێ باشەکان دەخوازن.


(جی. نیس. سۆڵت)

بەشی سێیەم

بۆ ژنان

# چۆن دەبیتە هاوسەرێکی نموونەیی؟

**ئیریك:** راستییەك هەیە، ئەویش ئەوەیە پیاو بە لایەنی كەمەوە پێویستی بە دوو كاتژمێر هەیە لە هەفتەیەكدا، كە لەبەردەم تەلەفزیۆندا رابكشێت، بێئەوەی وەڵامی پرسیارەكان بداتەوە، ئەویش تەنها بۆ ئەوەی كەمێك بحەوێتەوەو پشوو بدات.

**رای (٣٩) ساڵ، (٧) ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** پێویستە لەسەرت رێزی بە هێزی كاریگەری یاری تۆپی پێ بزانیت لە ئێوارەی هەموو دوو شەممەیەك.

**ئالان (٢٧) ساڵ:** تەنها یەك رۆژە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە، پێویستە رێزی ئەو مافە بگریت لە حەوانەوەو خواردنەوەی شەربەتو خۆشی بینین لە سەیركردنی یارییەكان بە هێمنی، فرێدانی خۆڵ و خاشاكو وەڵامی پرسیارەكانو هەموو شتێكی تر دەتوانرێت چاوەڕێ بكرێت.

**تۆم (٤٥) ساڵ، (٢) ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** واز بهێنن لە هەوڵ دانتان بۆ گۆڕینمانو زاڵبوون بەسەرماندا، ئێمە زێڕی خاو نین چۆنتان بوێت بیگۆڕن، بەڵكو ئێمە پیاوین، ئەو پیاوانەی كە كەوتنە داوی خۆشەویستیانەوەو لە یەكەم مەقامدا بوونە هاوسەریان.

**بیل (٤٧) ساڵ، (٦) مانگ پاش هاوسەرگیری دووەم:** زۆر سوپاست دەكەم لەبەرئەوەی هەوڵ نادەیت بم گۆڕیت هەتا ببمە وێنەیەكی نموونەیی، كە لە هزری خۆتدا ئارەزووی دەكەیت، بە تەواوی هەروەك ئەوەی كەسایەتیتم قبوڵ كردو خۆشم ویستی وەك ئەوەی كە هەیە.

**ای. جی. بولویر. لیتون:** متمانە بەبڕیارەكانم بكە لەسەر شتەكان بە بێگومان كردن لە هەموو شتێك بە تایبەتی بوارە بچووكەكان.

**جون (٢٧) ساڵ، (٧) ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** رەخنەكانت بۆ ئەو شتانەی كە شایانییەتی هەڵبگرە، كاتێك ئارامت لەگەڵ هاوسەرەكەتدا نامێنێت، ددانەكانت جیڕ مەكەرەوە، بەڵكو بیر لە خۆشەویستی خۆت بۆی بكەرەوەو هەستی پێ بكە.

**بن (٨١) ساڵ، (٥٥) ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوەو بە بەختەوەری دەژی سەرەڕای بوونی ئاستەنگو ناخۆشییەكان:**
مامەڵە لەگەڵ هاوسەرەكەت بكە بە هەمان پلەی رێزت لە مامەڵە كردنت لەگەڵ دایكو باوكت.

**بیل (٥٧) ساڵ، (١٦) ساڵ پاش هاوسەرگیری دووەم:** ئەو منداڵانەی لە هاوسەری یەكەمن بە هەمان شێوەی منداڵەكانی خۆت مامەڵەیان لەگەڵدا بكە.

**بول (٣٨) ساڵ، (٦) ساڵ پاش هاوسەرگیری دووەم:** وازبێنە لە رەخنە هەمیشەیییەكانت لە دایكم، من دەرك بەوە دەكەم كە نەگەیشتووەتە پلەیەكی تەواو، بێگومان چەند جیاوازییەك لە نێوان منو ئەودا هەیە، بۆیە پێویستم بە پەستانی زیاتر نییە بیخەیتە سەرم.

**الفرید (٦٨) ساڵ، (١٣) ساڵ پاش هاوسەرگیری سێیەم:** دایكو باوكم قبوڵ بكە بەو چەشنەی من لەگەڵ دایكو باوكت دەیكەم، كاتێك دێن بۆ سەردانمان دەمەوێت بە سۆزوخۆشەویستییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بكەیت، ئەگەر لەبەر ئەوانیش نەبێت، هەر لەبەر هاوسەرەكەت كە خۆشت دەوێت.

**رون (٤٠) ساڵ، (٦) ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** بەسۆزو لێبوردە بە لەگەڵ خەسووو خەزورت.

**جین (٧٦) ساڵ، (٥٦) ساڵە خێزاندارە:** ئەگەر هەستت بە توڕەییو ناخۆشی كرد بەرامبەرم، بۆچوونم وایە كە هێمن نابیتەوەو لێم خۆش نابیت پاش ئەوە، بەڵام پێویستە ئەوەت لە یاد بێت ئەوە تاوانێك نییە شایانی كوشتن بێت، بۆیە هەوڵ بدە كەمێك بەزەیی دەربخەیتو بە پێی توانا لێم ببوریت.

**روبرت (٤١) ساڵ: یەك ساڵ پاش هاوسەرگیری دووەم:** كاتێك ئارامی لە دەست دەدەم، پێویستە ئارام گربیت.

**الین (٣٣) ساڵ، یەك ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** هەوڵ بدە خاڵە لاوازەكانم قبوڵ بكەیتو یارمەتیم بدەیت لە چاككردنیان دا.

**دیریك (٤٥) ساڵ، بە تەمای زەواجی سێیەم پاش دووجار تەلاق:** من بە تەواوی دەزانم هەندێك جار یان زۆربەی كات كەسێكی (صعب المراس)م، پێویستە دەرك بەوە بكەیت كە ئەوپەڕی هەوڵی خۆم دەدەم تاكو كەسێكی باش بم، هەرچەندە هەندێ جار بە شێوەیەكی خراپ هەڵسوكەوت دەكەم.

**لین:** بەدرێژایی كات هەڵەكانم بیر مەخەرەوە، بەڵكو ئەو كارە باشانەی دەیكەم بە تەواوی بیربخەرەوە، هەروەك چۆن خراپەكانی باس دەكەیت.

**مات ٢٨ ساڵ، ٦ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** لە كاتی هەستانتان بە دامەزراندنی خانووەكەتان، هاوسەرەكەت هەندێك هەڵە دەكات: وەك داكوتینی هەندێ بزمار یان بە هەڵەگەیاندنی سوڕی كارەبای تایبەت بە گەرماوەكە، یان بڕیاردان بە دانانی دیوارێك لە شوێنێكدا كە گونجاو نییە، یاخود دانانی تورێك كە پێویستیت پێی نییە. بەڵام كاتێك لەوە تەواو دەبێت، ستایشی بكە لەسەر ئەو كارەی پێی هەستاوە، هەوڵ مەدە تێرامێنی لە هەڵەكانی، بەڵكو «وێنەكەی بە تەواوی بخەرە مێشكتەوە».

**هەموو پیاوان هەڵە دەكەن، بەڵام ئەوانەی هاوسەرگیریان كردووە زووتر هەڵەكانیان ئاشكرا دەبن. (رد سكیلتۆن).**




بۆ پیاوان

# چۆن دەبیتە هاوسەرێکی نموونەیی؟

**جینیفر (٣٢) ساڵ، ٣ ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** بەیناو بەین شتێکی لە ناکاوم بۆ بنێرە، بۆ شوێنی کارەکەم بۆئەوەی دەوروبەرم خۆزگەم پێ بخوازن کە من پەیوەندیم بە مێردێکی نموونەییەوە هەیە.

**ماریلی (٤٦) ساڵ، (٢٢) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** هەندێ شتی کتوپڕی بۆ بێنە، با سادەو ساناش بن، چونکە لای ئەو مایەی گرنگییە، وەك ئامادەکردنی هەندێك خواردەمەنی بێ ئەوەی ئەو داوای لێ کردبێت.

**روینا (٤٦) ساڵ، (٢٣) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** ئەو شتانەی بەلای منەوە زۆر گرنگن ئەو کارە بچوکانەیە کە رۆژانە هاوسەرەکەم پێی هەڵدەستێ، وەك پڕ کردنی پەرداخی ئاوەکەم وەختێك ئاوی تێدا نامێنێ، یاخود هەڵبژاردنی باشترین پارچە گۆشت لە نێو خواردنەکەدا، یاخود هەڵسان لە شەوێکی ساردا بۆ ئەوەی پەرداخێ ئاوو حەپێکی ئەسپرینم بۆ بێنێت.

**ئانا (٥٢) ساڵ، (٣٥) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە، لە تەمەنی (١٧) ساڵییەوە شووی کردووە:**

ئەو کارە بچوکانەی کە هاوسەرەکەم لە پێناوی مندا پێی هەڵدەستێت، لام زۆر بەنرخترە لەو دیارییە گرانبەهایانەی کە لە بۆنە تایبەتییەکاندا بۆم دەکڕێت.

**لیندا (٥٠) ساڵ، (٢٢) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە، هاوسەرەکەم:** کاتێك پێش من دەچیتە سەر جێگای نووستن ئەو لایەش رێكوپێكو ئامادە بکە کە منی لەسەر دەخەوم، هەڵگردنی گڵۆپە کزەکەشت بیرنەچێت، چونکە ئەوە وام لێ دەکات کە هەست بکەم کەسێك هەیە گرنگیم پێ دەدات.

**ماپی (٤٣) ساڵ، (٢) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** پێویستە لەسەرت بەیانیان هەڵم سێنی لە خەو، لێپرسراوێتی هەڵساندنو دەست پێکردنی رۆژی نوێم بخەرە ئەستۆی خۆت، (باشتریش وایە سەرەتای رۆژی نوێ بە هەندێك یاریو دەستبازی رۆمانسی دەست پێ بکات).

**بۆلا (٤١) ساڵ، (١٣) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** ئەگەر هەردووکمان لەیەك کاتدا لەخەو هەڵساین، هەوڵ بدە ماچێکی بچوکم بکەیت، ئەگەر ئێمە لە سەرەتای دەست پێکردنی هەموو رۆژێکدا ئاوا پەیوەندیمان دەست پێ نەکات، لەوانەیە وام لێبێت بە هەموو هەڵسوکەوتێکت قەڵسو نیگەران بم، باشتێکی ئاسایش بێت.

**دیبوار (٤٢) ساڵ، (٥) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** هەردەم هەوڵ بدە کە پێش خەوتن ماچم بکەیت، هەروەها ماچێکی تریش دەمەو بەیان سەرەتای رۆژێکی نوێ.

**بینی (٤٠) ساڵ، هاوسەرگیری دووەم کە تا ئێستە.. (١٥) ساڵە بەردەوامە:** ماڵەکە جێ مەهێڵە، تا بە ماچێك ماڵ ئاواییم لێ نەکەی.

**کاپی (٢٨) ساڵ، تەڵاقدراو:** کاتێك لەنێو پێخەفەکەتدا ئەم دیوو ئەودیو دەکەیتو بە گوێچکەمدا دەچرپێنی کە خۆشت دەوێم (با لە قوڵایی خەویشدا بین)، ئەم کارەت وام لێ دەکات کە ئەسیری خۆشەویستیت بمو بۆ کوێ بچیت بێم لەگەڵتو هەرگیز لێت جیا نەبمەوە.

**کارین (٤٦) ساڵ، هاوسەرگیری سێیەم کە تا ئێستا (٦) ساڵە بەردەوامە:**

هاوسەرگیری شایەنی ئەوەیە کە هەموو عەیبەکانی قبوڵ بکەی، تەنها لە پێناو ئەوەی کە یەك شتت دەست کەوێت: هاورێیەك لە جیهانێکدا کە هیچ گوێ بە تۆ نادا.

ئیریکا جۆنج، تۆش وەکو پیاوەکەی من هەڵسوکەوت بکە: کاتێك کاتژمێر (٣)ی بەیانی وەخەبەردێمو هەست بە نیگەرانیو دڵتەنگی دەکەم، دەست دەخاتە سەرشانمونێو لەپم لە باوەش دەگرێو پێم دەڵێت: هەموو کارەکان چاك دەبن، هەموو شتێك بە ئارەزووی تۆ دەبێت، هاوکات ناگەڕێتەوە نێو خەوەکەی تا من نەخەوم.

**کینیسا، (١٤) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** بەردەوام بەیناو بەین مۆمێك داگیرسێنەو چاوەڕوان مەبە تا کارەباکە دەبڕێت بۆ ئەوەی هەستی بەو کارە.

**لیندا (٤٨) ساڵ، (٢٨) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** بەردەوام ئەوەت لە یاد بێت کە تۆ خۆشەویستی منی نەك بە تەنها هاورێ، کەواتە لێ گەرێ با قسەکردنمان لەبارەی کاروباری رۆتینی نێوماڵەوە کەم بکەینەوەو ئاماژەو نیگای خۆشەویستیو لە ئامێزگرتنی پڕ سۆزو خۆشەویستی زیاتر بکەین، تا پەیوەندی خۆشەویستی ئەرکێکی قورسو رۆتینی نەبێت.

**بام (٣٧) ساڵ، (٩) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** پەیوەندی سۆزو خۆشەویستی مەکە بە پەیوەندییەکی خێراو رۆتینی، هەوڵ بدە تێکەڵ بە وروژاندنو موغامەرەی بکەیت.

**نانسی (٥٥) ساڵ، (٣) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** تکات لێ دەکەم بە نەرمو نیانیو سۆزو خۆشەویستییەوە ماچم بکە، نامەوێت قوتم بدەی.

**ئەلیسۆن (٦٨) ساڵ، (٢٣) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** هەوڵ بدە بەیناو بەین پێی بڵێیت تۆ جوانیو لەسەر ئەم ئاکارەت بەردەوام بە.

**دیبوار (٤٢) ساڵ، (٥) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** کاتێك هاوسەرەکەت پێت دەڵێت: «چۆنم؟» وا خۆت نیشانده کە زۆر بە وردی تێی دەڕوانیو پاشان شەیدابوونو تەواوی ئیعجابی خۆتی بۆ دەربڕە.

**سارە (٣٨) ساڵ، (٢٠) ساڵە جۆتە نێو ژیانی هاوسەرێتییەوە:** بە تەواوی تەماشام کە، پێش ئەوەی پێم بڵێی تۆ جوانی.

# هیممەتە بەرزەکان!

شێخانی



(بە هیممەتە بەرزەکان، لوتکە بەرزەکان بنیات دەنێین)، بەم وتانە (محمد بن راشد ئال مکتوم) میری میر نشینی دوبەی ئاهەنگی کردنەوەی گەورەترین بورجی لە دوبەی دەست پێکرد، کە بەرزییەکەی (٨٢٨) مەترەو ٢٠٦ نهۆمەو جێگەی (١٢٠٠٠) کەسی تێدا دەبێتەوە·

بێگومان تەنها بە هیممەتە بەرزەکان خەونە بەرزەکان دێنە دی، هیممەت بەرزان دەتوانن ئاواتو ئامانج بهێننە دی!

دەوڵەتی ئیمارات بە پێی پێشبینییەکانی ساڵی (٢٠١٦) بەرهەمی نەوتی تەواو کز دەبێتو بەرەو کۆتایی دەڕوات·

بەڵام هەر لە زووەوە سەرچاوەی نوێو ئەلتەرناتیفی بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی نەوت دیاری کردووەو گەشتوگوزارو بازرگانییان بە گەورەترین سەرچاوە داناوە، کە دوو سەرچاوەی هەمیشە زیندوون· هەموو ئەو کارانەش بە دڵسۆزانو هیممەت بەرزان دەکرێن، لێرەدا پێویستە بەرامبەر هیممەتەکانمان هەڵوێستەیەك بکەینو لە خۆمان بپرسین: هیممەتەکانمان لە ژیاندا چەندە بەرزن؟ چونکە گەورەیی ئێمە گەورەیی هیممەتەکانمان دیاری دەکات، ئامانجو خەونەکانمان گەورەیی ئێمە دەردەخەن، هیواو ئاواتو ئارەزووەکانمان سەربەرزمان دەکەنو وادەکەن سەرمان لە لوتکەی شاخە سەرکەشەکان بەرزتر بێت، بە پێچەوانەشەوە مرۆڤە هیممەت نزمو بێ ئامانجەکان بچکۆلەن با لە لوتکەی هەور بڕەکانیشدا بژین·

مرۆڤی هیممەت بەرزو هیوا بەخشیش لە پێناو گەیشتن بە ئامانجەکانی ئەگەر بە ناو قوڕو لیتەی ڕۆژگاریشدا تێپەڕ بێت، هیچ لە گەورەیی ئەو کەم نابێتەوەو ڕێگای بەرەو سەرکەوتن شەق دەکات·

دواتر بە سەرنجێکی ورد دەزانین کە کێن ئەو کەسانەی وڵات ئاوەدان دەکەنەوەو نیشتمان دەگەیەننە لوتکە، ئەو کەسانە نین کە حەزو ئاواتو خەونەکانیان لە سنوری لاشەیان تێناپەڕێتو جگە لە خواردنو خەوتنو رابواردن، هیچ ئامانجێکی تریان نییە·

وڵات لەسەر دەستی ئەو کەسانە ئاوەدان دەبێتەوە کە پێیەکانیان لەسەر زەوییەو ئامانجو هیواکانیان لە کەشکەشانی فەلەکەو بەدیدی ڕوونو گەشەوە لە ئاسۆیەکی ڕوون دەڕوانن‌و شەونخوونی دەکەن لە پێناو گەیشتن بە ئامانجە بەرزەکانیان·

هەڵبەت شەونخوونی کردن بەسەر لاپەڕەی ڕەنگاو ڕەنگی کتێبو بیرکردنەوەو پلاندانانو بەرنامە ڕێژیدا، زۆر جیاوازە لە شەونخوونی کردن بە دیار فیلمی تورکی دۆبلاج کراو و سیگار کێشانو مەینۆشیو گاڵتەو رابواردنەوە·

سەرکەوتنو پێشکەوتنو بەدیهاتنی خەونەکان لەسەر دەستی ئەو کەسانە دەبێت کە لە بەرەبەیاندا بە خەبەرنو پێش گزنگ دەچنە سەر کارەکانیان، نەك ئەو کەسانەی نیوەڕۆ خەو دەکەنو کاتژمێر (١٢)ی نیوەڕۆ بەیانی باش دەکەن·

بێگومان هیممەتەکانمان ئێستاو داهاتوومان دیاری دەکەن، بۆ خۆمانو وڵاتو نیشتمانمان، بە ئاواتیشەوەین ڕۆژێك بە شانازییەوە لە ئاهەنگی کردنەوەی پرۆژەیەکی نیشتمانی گەورەدا وەك ئال مەکتوم بڵێین: (نبني القمم العالية بالهمم العالية)!!

بەڵام ئەم کارە دوای ئەوە دەکرێت کە هەموو ئەو وەسیلانەی ئەمڕۆ خراوەتە گەڕ بۆ دروستکردنی نەوەیەکی بێ هیممەتو بێ ئامانجو بێ سوودو بێ بەرنامە، بگۆڕێت بە پرۆژەی بەسوودو ڕاگەیاندنو خوێندن، سەرمایەی وڵات بۆ پێگەیاندنو هۆشیار کردنو پێشکەوتنی نەوەکان بەکاربهێنرێت، نەك بۆ ئیفلیج کردنیان·